# چیرۆکی
# خۆشەویستییەکی مەجوسیانە

عەبدولڕەحمان مونیف

وەرگێڕانی
حەسەن جاف

وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان بەرێوەبەرایەتی گشتی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەرێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **چیرۆکی خۆشەویستییەکی مەجوسیانە**

- **نووسینی:** عەبدولڕەحمان مونیف
- **وەرگێڕانی :** حەسەن جاف
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران رواندزی
- **بەرگ:** جێگر عەبدولجەبار
- **نرخ:** ٢٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم ٢٠١١**
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانە:** چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری لاوان (هەولێر)
- **لە بەرێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(٦١٧)ی پێدراوە.**

زنجیرەی کتێب (٦٥٥)

**ئەو کتێبە و کتێبەکانی وەزارەتی**
**رۆشنبیری لەسەر ئەو ماڵپەڕە بخوێنەوە**
**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**www .Kurdchap.com**

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

## العتبة – دەروازە–

لێتـــان ناپاڕێمــــەوە، ســـۆزو بـــەزەیی ئێوەشـــم نـــاوێ، ئەگـــەر خێرئەکـــەن ئـــەوا بـــە ســـوالکەرانی بکـــەن. مـــن ســـوالْ کـــەرنیم، هـــەروەها خۆشـــم بـــەدز و ڕێگـــر نـــازانم. لەگـــەلْ ئەوەشدا کێشـــەیەکم هەیـــە، کێشەکەشـــم، بـــێ وشـــەی گـــەورە، ئـــازار دلّـــم دەگوشـــێ. ئەمـــە تـــازە نییـــە بـــە گـــوێرەی ئـــەو ژیانـــەی مـــن تیایـــدا دەژیـــام. بـــەلاّم ئیشـــەکە لـــە ســـاتی دیاریکراودا دەگاتە ڕادەیەك کـە مـرۆڤ نـاتوانێ بەرگـەی بگـرێ. کـەوابێ وشـە لـە هەنـدێ جاردا هـۆی ڕزگارکردنمـە. دلّنیـام بـەلاّم وای بـۆ دەچم لەوانەشـە قسـەکردنە.. بەتایبـەتی لەگـەلْ ئێـوە ئـازارێکی نـوێ بـێ، لـە چـاوە مـردووە پـڕ گالّتەجاڕیەکەتانـەوە بـۆم دێ، گـرنگ نییـە چـیتان دەوێ بیلّـێن، لەگـەلْ ئەوەشـدا دەبـێ قسـە بکـەم، دەلّـێن خەونـە؟ هەرزەکارییە؟ بـێ بەشـییە؟ دەتـوانن هـەموو شـتێ بلّـێن. ئـەوەی مـن هەسـتی پێدەکـەم خۆشەویســـتییەکی ڕاســـتەقینەیە کـــە بـــیرم دەکەوێتـــەوە دەلـــەرزم، خـــەمباردەبم لـــە مێشـکمدا جۆرەهـا بیرۆکـە دەنـگ دەداتـەوە، کـە لـە ژمـارە نایـەن، هەنـدێ جـاریش حەزدەکەم دەس بە گریان بکەم.

جارێکیـان چـیرۆکەکەم بـۆ بـرادەرێ دەگێڕایـەوە. پـێش ئـەوەی تـەواوبم زەردەخەنەیـەك گرتـی، زەردەخەنەکـەی لـەنێوان بـەزەیی و گالّتەپێکردنـدا بـوو. کـە پـێم گـوت: " مـن خۆشـم دەوێ" لەسـەر خـۆ و هـێمن وەلاّمـی دامـەوە و دەسـتی کێشـابە سـەر دەسـتمدا هەولْ بدە باسی ئەم نەکەی جارێکی دیکە. بەتایبەتی لەگەلْ غەیری مندا.

هاوارم کرد و بەتووڕەییەوە.

بەلاّم خۆشم دەوێ.

ڕامانە ساردەکەی تـێ بڕیبـووم. هەسـتم کـرد کـە ڕووت و زەلـیلم. سـەرەتا سـەیر بـوو بەلامـەوە. چـونکە وامـدەزانی ئەمـە ئـەو کەسـەیە بـۆ ئـەوەی باسـی ئـەم داواکارییـەی خـۆمی لەلابکـەم. بـەلاّم کـە هێمنییەکـەیم بینـی. پاشـان زەردەخەنـە گالّتەجاڕییەکـەی هەستم بە داهێنان کرد.

کە منی بینی برینـدار و دۆڕاو، بێـدەنگ بـوو. پاشـان ویسـتی بـەجۆرێك پـێ بکـەنێ. بەلاّم هەموو شتێ کۆتایی هاتبوو.

بەجۆرێکی حەکیمانەو سارد لەدەمییەوە چەند وشەیێکی نوێ دەرپەڕی، رووداوی زۆر بەسەر مرۆڤدا تێدەپەڕێ... بەڵام ئاقڵ ئەو کەسەیە بەپەلە خۆی لە وەهم رزگاردەکا.

دووبارە هەستم بە تووڕەبوون کردەوە و هاوارم کرد.

- بەڵام ئەوەی من هەستی پێدەکەم وەهم نییە، راستییە.. لە بوونی ئێمە.. من و تۆ واقیعانەترە. لەپڕ هەستم کرد دەروونم پڕبوو لە بەرەنگارییوونەوە،

- کە گوتم دڵنیابە دەیبینم.

دوای ئەوە دەنگم زۆر بە کزی هاتە دەر،کە گوتم:

- لەوانەیە رۆژانی دوایی تەمەنمان بەیەکەوە بەسەربەرین.

- کە ئەم وشانەم گوت زۆر بە زەحمەت هەناسەم بۆ درا. تەماشام کرد بۆ ئەوەی بزانم کاریگەریی وشەکانم لەسەر ئەو چۆنە، دەم و چاوی گرژببوو وەك بڵێیت لە چاوی مندا تیشکێکی رەنگاوڕەنگی ترس و گومان و ئارەزووی گریانی دیبێت.

بەزەردەخەنەی گاڵتەجاڕی و بەزەیی گوتی :

- ئەگەر بیر لەمە دەکەیتەوە تۆ نەك خەو دەبینی. بەڵکو حەز دەکەی لە وەهمدا بژیت.

پاشان دەستی کرد بە قسەکردن لەسەر بابەتێکی دیکە بۆ ئەوەی من سەر لە نوێ باسی نەکەمەوە.

* * *

ئایا دەکرێ ئەمەی روویدا بە چیرۆك دابنرێ؟ ئایا دەکرێ بەقەدەرێکی گاڵتەجاڕ دابنرێ؟ نامەوێ لە گێژەلووکەی وشە کوێرەکاندا بزرببم، چونکە ئەو هەستەی بەسەرمدا زاڵ دەبێ، کە بیری لێ دەکەمەوە لە شێت بوون نزیکم دەکاتەوە. ئەو کاتانەش کە دیمەنی ئەوی تێدا تێدەپەڕێ زۆرە، بەڕادەیەك کە ناتوانم جگە لەو بیر لەکەسی دیکە بکەمەوە.

وەك پێم گوتن... داوای رەحم پێ کردن ناکەم. چونکە من رقم لەو هەستە زەلیلەیە ناشمەوێ راتان وەربگرم. چونکە ئەو رایە کە لە لێوتان دێتەدەر لە باشترین حاڵەتدا لەرای برادەرەکەم باشتر نابێ. کە گوێ ی بە دڵی من نەدەدا.

مــادام وايــە و بیروبۆچــوونی مــن بــەو رادە گەورەیــە خراپــە دەربــارەی ئێــوە. ئەوســا لەوانەیە پرســیاربکەن. ئــەی کەواتــە بۆچــی ئەمــەی روویــدا بــۆ ئێــوەی دەگێڕمــەوە؟ چــیم لێتان دەوێ؟ بۆ ئەوەی ڕێتان لێ بگرم و دەمتان داخەم دەڵێم!

کەنیســەی کاســۆلیکی دڵ پــڕ ڕەحــم ڕێگەیــەکی بــۆ مــرۆڤ دانــاوە تــا رزگــاری ببــێ، کــاتێ باوکــە پیرۆزەکــانی راســپارد گــوێ لــە دان پێــدانان بنــێن. هــەروەها زاســتی دەروونناســیی هاوچــەرخ بــەو رووناکییــە کەمــەی ژووری نــوژدار و ئــەو کورســییە نەرمــەی نەخۆشــەکەی لەســەر رادەکشــێ، ڕێگەیــەکی دۆزیوەتــەوە بــۆ تواندنــەوەی ئــازار و لەدواییشــدا چــاك بوونــەوە. ئێــوەش ئایــا بــاوکی پــیرۆزی کەنیســەن یــان نــوژداری دەروونناسیی و گوێ لە دان پێدانان دەنێن.

جارێکی دیکە بەلامەوە گــرنگ نییــە، دەمــەوێ ئــەوەی روویــدا دەڵــێم. ئەگــەر ئاســمان بەسەر زەوی دا، ئێــوەش ئەگــەر ویســتتان بڕیاربــدەن ئەگــەر ویســتتان چــیتر مەخوێننــەوە. تەنانەت ئەگەر بشــخوێننەوە. هــیچ ســیفەتێکی تــازە ناخەنــە ســەر ئــەو ســیفاتە زۆرانــەی خۆم، کە خۆم لە بارەی خۆمەوە دەیزانم.

## چیا:

ئەوە لە هاویندا روویدا. کۆتایی هاوین.

دوای رەشــەبایەکی تونــد رووی ئاســمــان تــەڵخ بــوو، تێکچــوو و بــارانێکی بــەخوڕ دایکرد. لــەو کاتــەدا مــن لــە رۆخــی دەریاچــەکە بــووم بــیرم ئــەکردەوە، بــیرم لــەو خەمــە بچووکە دەکردەوە کە خەریکە دڵم داگیردەکا.

دوای دڵۆپەکانی ســەرەتا هەســتم بەگەشــانەوە کــرد، بــەڵام کــە دیــتم بارانەکــە تونــدتر دەبێ رامکرد بۆ ئــەوەی بگەمــە بــالکۆنی ئۆتێلەکــە. کــە رامکــرد تــەڕبووم. کــە لــە ژێــر بالکۆنەکــەدا وەســتام و دەســرێکم دەرهێنــا بــۆ ئــەوەی ســەر و ملــم بســڕمەوە. دووبــارە و لەپڕ هەستم بەلەزەتی باران کردەوە.

ســاردییە نەرمــە خۆشــەکەی لەتــەپڵی ســەرمەوە شــۆڕدەبووەوە تــاکو ختووکــەی هەموو شــانەیەکی لەشــم بدا..پاشــان لــە ئێســقانەکاندا جــێگیر ببــێ. لێگــەڕام دڵۆپــەکانی بــاران و ســاردییەکەی بەلەشمــدا بڵاوبێتــەوە. پێویســتم بــەوە هــەبوو. بــەڵام لــە ســاتێکدا (ساتێکی نەزانراوو غەریب بوو) هەســتم کــرد لــە پشــت شووشــەکەوە چــاو هەیــە تەماشــام

دەكـاو دیمەنەكەشـم مایـەی گاڵتەجاڕییـە. ئـاوڕم دایـەوە تـاكو تەماشـا بكـەم، داوای لێ بـووردن بكـەم (وا هەسـتم كـرد كـە وێنەكـەی لەبیرەوەریمـدا بـوو) تەماشـام كـرد چـاومان پێك گەیشت. دووەم جار بوو لە هەمان رۆژدا چاومان پێك بگا.

جـاری یەكـەم پـێش نیوەڕۆبـوو، دنیـا گـەرم و نـاخۆش بـوو، ئەوانـەی لـە ئۆتێلەكـەدا چـووبوونە رۆخ دەریاچـەكە، ژنـان نیمچـە رووت، پیـاوانیش بـە ورگـی بچـووك و پشـتی سـووتاوەوە، منداڵـەكانیش خانوویـان دروسـت دەكـرد پاشـان دەیانڕوخانـد... بـێ ماندووبوون.

لـەو كاتـەدا زۆر بێزاربـووم. كتێبەكـەی بەردەسـتم لـێم بـوو بـە دوژمـن، دوای ئـەوەی وشەكانی بـوون بـە پەڵەهـەوری رەشـی بـێ مانـا چـیتر نـەمتوانی بخوێنمـەوە و نـەمتوانی هیچی دیكە بكەم. بەتایبـەتی كـە هەسـتم بـە سـاردیی ئـاوی دەریاچـەكە كـرد و لەچـەند دەقیقەیـەك زیـاتر نـەمتوانی بەرگـەی بگـرم. ئـەو خەڵكـەی دەمـدی هەریەكـە و جیهانێكی داخراو بوو یان وێنەكـە بـەو جـۆرە بـوو لـەو كاتـەی مـن بەسـەر لـەش و دەم و چاودا تێدەپەڕیم.

لـە سـاتێكدا نـازانم كـام سـات بـوو چـاومان بەیـەك گەیشـت، نزیـك و لەسـەر زگـی راكشابوو. دارێكـی بچـووكی بەدەسـتەوە بـوو لمەكـەی پـێ تێكـدەدا، بـەڵام هەركـە چـاوم بەسەر پشتیدا خشا داچڵەكی و بەپەلـە وەرگـەڕا و چـاوی تـێ بـڕیم، لـەو سـاتەدا چـاومان بەیەك گەیشت.

دەبـێ بـڕوا بكـەین لـە مرۆڤـدا شـتێكی نادیـارو سەرسـوڕهێنەر هەیـە، كـە هـەر كـە بینم وام هەست كرد، كە هـەزاران سـاڵە ئەیناسـم. ئەمـە گومـان نییـە. بـەڵكو راسـتییە، راستییەكی رەهاو تەنیا.

دووچـاو كـە خـەمیان پێوەدیـارە، لێـوی تـەنك كـە ئـەوی خوارەوەیـان شـۆڕبۆتەوە بـە جـۆرێكی بەلـەزەت و كارەسـاتبار و نـەفرەت لێكـراو . لای دەم و چـاوی وەسـتام. لەشـە رووتەكـەیم نـەدی. ناشـزانم بۆچـی هەسـتێكی تونـد بەسـەرمدا زاڵ بـوو، كـە مـن مـافی ئـەوەم نییـە تەماشـای لەشـی بكـەم. لەسـاتێكی دیكـەدا هەسـتێكی تونـد وای لـێم كـرد بـە خـۆم بڵـێم ئەگـەر تەماشـای ئـەو لەشـە بكـەم لەوانەیـە پیسـی بكـەم. لەبیرمـە مایۆیەكی زەردی لەبەردابوو. ئیتر لەوە زیاتر هیچی دیكەم لەبیرنییە.

تێڕوانینەکـە ماوەیـەکی زۆری خایانـد، ئـەو تەماشـاکردنە پـڕ سـۆزو بـەرەڵلایی بـوو. هـی منـداڵێکی هـار و دایکێـك، لـە چـاویدا جیهانێـك لـەپیت و بـەرەڵلاییم بینـی. جیهانێکی بـێ کۆتـایی. دڵـم خـۆش بـوو، خـەریك بـوو لـە خۆشـیا هەڵپـەڕم. لـەو زیـاتر کەسـی دیکـەم نـەدەدی. ویسـتم هاواربکـەم. سـەما بکـەم. بیرۆکەیـەکی دیکـە بـە مێشـکمدا تێپـەڕی؟ بـڕوا بکـەن تـا ئـەم کاتـە درەنگـە نـازانم! هەسـتم بـە شـێتی کـرد، هەسـتم کـرد ئـارەزووی ژیـان لـە لەشمـدا جـۆش دەدا. لـەو کاتـەدا دڵنیـابووم کـە بێـزاری درۆیە وجوودیـەکان و خەڵکـە دەوڵەمەندەکـە خولقاندوویانـە. بـە خـۆمم گـوت: " نـابێ و نـاکرێ دەسـت لـەم خۆشـییە هـەڵبگرم." ئـەو خۆشـییە وەك بوومەلـەرزە دەیبزوانـدم و وەك گڕکـانیش لـە ناخمـدا دەتەقییـەوە، ئایـا تەماشـاکردنەکەم زۆری خایانـد؟ کەسـی دیکە بینی؟ بڕوابکەن من نازانم.

کـە وەسـتا تەماشـای دەوروبـەری خـۆی کـرد. تەماشـاکردنەکەی هـیچ پرسـیارێکی لەگـەڵ خـۆدا هەڵنـەگرتبوو. دەنکـە لمـەکانی بـە بێزارییـەوە لەسـەر زگـی تەکانـد و کورسـییەکی بچـووکی قوماشـی راکێشـا، کـە خـۆی بەسـەردا دابـوو. کـە زۆر وەسـتا پرسی:

- بیر لە هەڵسان ناکەیتەوە؟

سـەری رەزامەنـدیی ڕاوەشـاند و هەڵسـا، هـیچ قسـەیان نـەکرد، لەسـەر خـۆ رۆیشـتن. بـەڵام لـە سـاتێکدا "نـازانم بۆچـی روویـدا." ئـاوڕم دایـەوە تەماشـای دەکـردم. بـە ڕوانینەکـەی خنکانـدمی، هەسـتم کـرد کـە دەڕۆیشـت و دووردەکەوتـەوە، دڵـم دەگوشـرێ، کە لـە قەرەباڵغییەکـەدا ون بـوون ئـاوڕم دایـەوە.. دووبـارە خـەڵکم دی. ئـەو خەڵکـە وەك قوتـووی کـانزای قفڵـدراو وابـوون. چـاوی داخـراو. چـەناگەی شـۆڕبووەوە تـا بەربەرسـنگ دەکەوت.. لێوی داکەوتوو.. بێدەنگی.

کــە دوورکەوتنــەوە. وەك "شــبح:تارمایی" بــە لاپاڵەکــەدا هەڵدەگــەڕان بــەرەو ئۆتێلەکە، هەستم بە تەنیایی و ئازارکرد.

لـە هـۆڵی نـان خـواردن نزیـك دانیشـتم " رێکـەوتی کـوێر پـاڵی پێوەنـام بـەرەو ئـەو گۆشـەیە" وامزانـی مێردەکـەی چـاوی هەیـە لـە دواوە و چـاودێریم دەکـاو بەدوامـدا دێ لەم گەشتە خەتەرەمدا. تـرس و شـڵەژان راپێچـی کـردم. بەرانبـەرم دانیشـتبوو ئـەویش لـە

تەنیشتییەوە و پشتی لـە مـن بـوو.. دوو منداڵـە بچـووکەکەش لـە دوو سووچـی بەرانبـەر یەك دانیشتبوون.

بـە درێـژایی مـاوەی خـواردنی نـانی نیـوەڕۆ نـەمویرا تەماشـای بکـەم، ئەمـەش دیـداری دووەم. لـەژێر بالکۆنەکـەدا وەسـتاوم وەك سـەگ تـەڕم، شـێتم بەتەماشـاکردنی ئـەو دەریاچـەیەی خـوێنمی هەژانـد، وای لێ کـردم زۆر بیربکەمـەوە، هەسـتم بـەباران نـەکرد، کـە لـە بالکۆنەکـەدا وەسـتابووم وێـرام تەماشـای بکـەم، دارێـك لـە دارەکـانی سـالۆنەکە دەکەوتـە نێـوان مـن و مێردەکەیـەوە، بـەلام لـەلای ئـەوەوە هـیچ بەربەسـتێك نەبوو، ئەمەش یارمـەتی دام لـەو لەزەتـە بنۆشـم بـێ وەسـتان (سروشـت گەنجینەیەکـە لـە مرۆڤـدا هێـزی نـەبینراو دەتەقێنێتـەوە)، دەمویسـت شـارەزای بم، زۆر بـیرو بۆچـوونم بـۆ هات، کە ناوێرم بیانلێم.

پێتانم گوت لە مرۆڤدا شـتێکی نادیـار هەیـە، کـە تێگەیشـتن نـاییێ. هەرئەمـەش بـوو کە روویـدا. بەشـێوەیەك دڵنیـابووم کـە جیهـانێکی تایبـەتیی هەیـە، جیهانەکەشـی، نـەك لە جیهانی مێردەکەی دوورە، بەڵکو بە تەواوی جیاوازیشە.

دەم و چـاوی خۆشـی پێـوە دیـاربوو و بـڕیش بـوو لـە تەندروسـتی و رازی بـوون، بـەلام ئـەو دوودڵ و مانـدوبوو و برێکـی خەمیشـی هـەبوو، کـە وای لێ دەکـری خۆشـت بـوێ. روخسـاری نـەرم و لەشیشـی لـە بچـووکییەوە نزیـك بـوو. بـەلام کورتـە بالانـەبوو، بـەلام جـۆرێ لـە ژنـان هـەن کـە هەسـت بـە جوانییەکـەی دەکـەی بـەرەو دەرەوە و بـەهێز خـۆی دەردەخا لە لەشێکەوە کەلە لاوازییەوە نزیك بوو.

لەجامەکـەوە کـە تـۆزێ تـەڵخ ببـوو، چـاوەکانی قسـەیان کـرد، بـەدەنگێکی کـز قسـەیان کـرد، کـە لـە چـپەی گریـان دەچـوو. لـەپڕ تـرس بەسـەرمدا زاڵ بـوو، وشـە و بیرۆکـە لەمێشـکمدا وەك هەورەتریشـقە لەیـەك دەکـەون. تـۆ کێیـت؟ ئـەم بایانـە بـەرەو کـام گەشـتی ترسـناکمان دەبـەن؟ ئـەو سـپیاتییەی چـاوت بـەدوای بەنـدەردا دەگـەڕێن، منیش ماندوو لـەم گۆشـە دوورەی جیهانـدا فـڕێ دراوم، ئایـا ئەشـێ مـن ئـەو بەنـدەرەبم. دەسـتێکی بچـکۆلە و فێـنکم دەوێ پشـتگیریم بکـەن، هەسـت دەکـەم شـتێك لـە ناخمـدا بەخێرایی وردوخاش دەبێ و لەناو دەچێ.

بێـدەنگ هـاوارم کـرد لـە کاتێکـدا وەکـو کەڵەشـێرێکی نـەڕ ڕاچڵەکیم. شووشـەکەی نێوانمـان خورپـەی دڵ درەودەکـا و پاشـان وەك تۆپەڵـە ئـاگرێ دەیشـێلێ و پـاڵی پێـوە دەنێ. پاشان باران دێ لەزەتی خەونەکە دەتوێنێتەوە.

سەرم کەمێ ڕاچڵەکاند، چەند دڵۆپە بارانێـك هاتنـە خـوار، هەستم بەلـەزەت کـرد، دڵـم پڕبـوو لـە خـەم، بەچـاو پـێم گـوت : ببەخشـە، بـەجێم بێڵـە. تـۆ پـیرۆزی تـا ئـەو رادەیەی کە نەتوانم لێت نزیـك ببمـەوە. دەسـتی منـداڵێکی بزێـو دارەکـەی راوەشـاند. کـە دەم و چاوی مێردەکەیم بینی شڵەژام. بۆ ساتێکی کەم ئاوڕم دایەوە.

بـەخۆم گـوت ئەگـەر ببینـێ بـەمجۆرە تەماشـای دەکـەم چـاوم دەردێنـێ، مشـکێك دەخاتە پشتم. لەژێر جلەکانم و تونـد پـاڵم پێـوەدەنێ بـۆ ئـەوەی بـڕۆم. رابکـەم، لـە دۆڵـی بەرازانـدا. بـە رووەکـە سـەوزەکەم گـوت : ئـەی دارە پیرۆزەکـەی هـەموو کـاتێ وەك شورایەك لەنێوان من و ئەوانەی دەیانەوێ بمکوژن بەرزببەوە.

رووەکـە سـەوزەکە وەك پانکـەی بچـووك جاروبـار بەقـەد ناولـەپی دەسـت جـاری دیکـەش گـەورە و زەبـەللاح وەك چـیای، بڵنـد، لـە کـاتی دیکـەدا رەش وەك دارسـتانی سـندیان. بـەڵام لـە هـەموو کاتەکانـدا و لـەو درزە تەسـکانەوە دڵۆپـە ئـاوی روون دەدرەوشـانەوە، چـاوەکانی دەدرەوشـانەوە، چـیتر لـەو هـەورە قورسـانەوە بـاران نـەدەباری. خۆشی رەنگاو رەنـگ بـوو. هەسـتم بـەو دەنگانـەی دەوری خـۆم کـرد وەك سـروودبن و لـە شوێنێکی دوورەوە دێن.

لە ساتی دیکـەدا هەسـتم کـرد گـەردوون وەك دەسـتی دایـك بـێ وابـوو وازم لـە چـاوم هێنـا گەشـتی خـۆی بکـا، بـەڵام هـەر کـە دەگەڕانـەوەو لـە چـاوی ئـەودا جێگیردەبـووم هەسـتم دەکـرد دووبـارە و سـەر لـە نـوێ لـەدایك بوومەتـەوە. چـاوەکانی خـەم و شووشـەیان دەبـڕی و دەگەیشـتنە لام. تەماشـاکردنەکەی جیهـانێکی منـداڵ بـوو بـێ پەروا بەرەو خۆشی و خەم رای دەکرد.

بە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی توند خـۆم بـە خـۆمم گـوت: رقەوکینـە دەکـوژم بـێ ئومێـدی و کتێب دەکـوژم، بیرکردنـەوەی بـێ مانـا کـە لـە هـەموو شـتێکی دەوروبـەرم دامـدەبڕێ. ئەوا لە نـزیکترین زبڵخانـە دەنێـژم. لـە سـاتێکی دیکـەدا و بەسـووربوونەوە گـوتم: مـن وا دەسووتێم ئێستا دەسووتێم بـە پەرۆشـی شـتێ کـە پێشـتر هەسـتم پـێ نـەکردبوو پرسـیاری سەیر بە مێشکمدا تێپەڕی : لەکوێ دەژیـام؟ چـۆن دەکـرێ مـرۆڤ بـژی بـێ ئـەوەی هەسـت

بکـا؟ ئایـا ژنـیٚ دەتـوانیٚ لەڵـدا ئـەم گشـتە خۆشـی و گۆڕانییـە مەجۆسـیانەیە دروسـت بکا؟

خـوێن وبیرۆکـە بەخێراییـەکی سـەیر لـە مێشـکمدا دەتەقینـەوە، کـە نەمـدەتوانی چیتر رابوەستم بەرانبـەر هـەر وشـەیەك یـان بیرۆکەیـەك ،ناچـار بـە خـۆمم گـوت. جـاران ئـەوەی دەیـانگوت سـەبارەت بـەو شـتەی پەرۆشـی پـیٚ دەڵـێن ،دەمخوێنـدەوە.... پێدەکەنیم : پرسـیارم دەکـرد ئایـا دەکـریٚ مـرۆڤ ببـیٚ بـە (بنـدول) نەراوەسـتیٚ و نەهێـدی بێتـەوە؟ ببـزویٚ بـەبیٚ مانـا؟ پەرۆشـی ژنێـك بـیٚ؟ چـاوەڕێی بکـا؟ وەڵامـی خـۆم دایـەوە: من ئێستا دەکەومە ناو ئەو شتە نادیارە.

ئـاه.. دەتـوانن پـیٚ بکـەنن، پـیٚ بکـەنن وەك هێسـترێك کـە تـا کۆتـایی دەمـی دەکاتەوە. کەوت .هەستم کرد دڵم وەك بەلەم لە سنگمدا دەبزویٚ.

گوتم ئەمـە سـەرەتای بـیٚ ئەقڵییـە. چـاوم دووبـارە کێشـایەوەو تەماشـای هـەورو دارە دوورەکانم دەکرد، بـەڵام هەسـتم کـرد وا تێکدەچـم. پاشـان دوای سـاتیٚ شـتێکم بیسـت لـە ناخمدا لەت و پەت دەبیٚ و دەگرییٚ.

کـەمیٚ جووڵامـەوەو هەسـتم کـرد دەبـیٚ شـتیٚ بکـەم. هـەر شـتیٚ، بـەڵام هەسـتێکی دیکەم بۆهات لـەو کاتـەدا، لـەپڕ هەسـتم بـە سـەرماکرد، هەسـتم کـرد مـن لـە قـووڵایی گـردی سـەهۆڵدا نێـژراوم و لەپشـت شووشـەکەوە بـەبزمار قـایم کـراوم و نـاتوانم بجـووڵێم. بەخۆبەدەسـتەوەدانێکی بـیٚ مانـاوە ویسـتم درۆبکـەم. هەڵەبکـەم، بـەڵام چـاوەکانی کـە سـەیریان دەکـردم برینـداریان دەکـردم. وایـان لـێم دەکـرد زیـاتر هەسـت بـە هـەنگاوەکانی بکـەم، کـە بـەناو خوێنمـدا گوزەردەکـا چـاوم دەکێشـایەوە، دوور دەمڕوانـی، بـەڵام بـیٚ ئەوەی بـەخۆم بـزانم خزامـە نێـو درزە بچـووکەکانی نێـوان گـەڵاکانی رووەکـە سـەوزەکە و لـەویٚ لێـی دەکـەوم. تەماشـادەکەم.. تەماشـای چـاوەکانی دەکـەم... ئـاه.. ترسـی ئـەو چاوانەی دەیانبینم چـەند تونـدە چـەند جوانـە. بەچـپەوە پێـی دەگـوتم : ئـەی غـەریبی بـیٚ ماڵ، ماڵی تۆ لـە چـاوی مندایـە لـەم دوو چـاوەدا جۆلانـەت بـۆ دەکـەم. لـەو جۆلانەیـەدا ئەوەندەی لە تەمەنت ماوە تیایدا بەسەر بەرەو و قەتیش پەشیمان نابێت.

ئێسـتا.. دوای سـاڵانی دوورودرێـژ دەمـەویٚ بگـریم. بـۆ رام نـەکرد؟ بـۆ وامزانـی نەمدیوە و هەزاران جـاریش دیبـووم؟ بەدرێـژایی تەمـەنم خـەونم پێـوە دەدیت.لـە سـاتێکی

پڕ لە خۆشی هەموو شتێ لام وای لێهات کە نزیکە، نەرمە، کاریگەرە ،بۆیە بڕیارم دا بمێنمەوە.

باران خۆشی کردەوە، ئایا زۆری پێ چوو؟ یان کەم؟ نازانم، کە تەماشای دوورم کرد هێشتا چیا سەوزەکان چاوی خۆیان هەڵدەگلۆفی و دەیانکرد بە جۆگەلەی بچووك بە چاو قایمییێکی منداڵانەوە بەرەو لاپاڵەکان شۆڕدەبێتەوە. گەلا سەوزەکان دوای ئەوەی خۆی وەك باڵی باڵندەی بەهێز کردبووەوە. دوای بارانەکە شل ببووەوە. بەردەکان.. بەردەکانیش وەك پارچە شووشەی رەنگاو رەنگ دەبریسکانەوە. هێشتا شووشە لەنێوانماندا بڵندو توند و هەمیشەییە، چاوەکانیشی دووکۆترن بە ئازار خۆیان شتووە، بەڵام بەدوای خۆشییەکدا رادەکەن.

بێ دەنگ و بەکینەوە بەخۆمم گوت: ئەی خەمی رۆژگارە ناخۆشەکان وەك مێش پانت دەکەمەوە و لەمەودواش خەم ناخۆم. ئەو گیانەوەرە بچووکە چاو بەستراوەی پێی دەڵێن ترسنۆکی ئەویش دەکوژم.

گیانەوەرە بچووکەکە لە خوێنمدایە، لەناو دەمارەکانمدا لە هەموو شتێ پەشیمان دەبوومەوە، پەشیمان دەبوومەوە لەو کارانەی کە نەمکردبوون. لەپڕ ئەبم بە باڵندە، دوور ئەفڕم، ئەفڕم و دەگەڕێمەوە ئەو شووشەیەش چەند لەشێتی دەیپاراستم ئەوەندەش شێتییەکی دیکەی لە سنگمدا دەچەقاند. بە گاڵتەجاڕییەکەوە بە خۆم گوت: یەك جار لە دایك دەبین، یەکجاریش دەمرین ،منیش ئێستا لە دایك دەبم لە چاوەکانیدا لەدایك دەبم ، چاوەکانن ، پێدەکەنی هەست بە پێکەنینە بچووکەکان دەکەم لە خوێنمدا رادەکشێن ئاگری تێ بەردەداو دەیکوژێنێتەوە.

بێ ماندووبوون دەپرسم: ئەمە چییە؟ دەکرێ پەرۆشی بێ؟ ئایا ئەمەم لە کتێبێکدا خوێندۆتەوە؟

بڕوا بە هیچ شتێ ناکەم ، هەردوو چاوەکە تێم دەڕوانن. سەردەکەوم و دادەبەزم پاشان دەتەقمەوەو نامێنم.

کە باران خۆشی کردەوە و دەوروبەر پڕبوو لەو بۆنەی هیچ وشەیەك لە گەردووندا ناتوانێ وەسفی بکا، راچڵەکیم پاشان ئەوەندەم زانی بێ ویستی خۆم دەڕۆم. بەدەوری ئۆتێلەکەداسووڕامەوە و لای دارسنەوبەرە گەورەکەدا راوەستام. دوا دڵۆپەکانی باران

کــە بەســەر گــەڵاکانی دار ســنەوبەرەکەوە بــوو وردە وردە دارژا. ســەرم بــەرزکردەوە بــۆ ئەوەی دڵۆپەکانی لەدەم و چاوم بدا و خەریك بوو دەس بە گریان بکەم.

دابەزیمــە ســاڵۆنە فراوانەکــەی ئۆتێلەکــە، بــێ دوودڵــی چــوومە سووچــە دوورەکــەو دانیشــتم، ســێ یــان چــوار مێــز لــە نێوانمانــدا هــەبوو ،دوانیــان لــە رێکــی ئــەو دابــوون و یــەکێکیان بەشــێکی زۆری لەشــی دادەپۆشــی و دەیشــاردەوە، بــەڵام ســەری ئەگــەر بــەرزی بکردایەتــەوە، وەك چیا بەفرینــە دەردەکــەوت ،گەشــاوەو پەمــەیی .ئایــا ئاگــای لــێم بــوو کــە چــوومە ژوورەوە، بۆچــی جــۆری دانیشــتەکەی گــۆڕی و بــەرەو رووی مــن دانیشــت، پاشــان هەســتم کــرد ئــارەزووی ئــەوە دەکــەم کــە دەس بــە شــتێکدا بهێــنم دەســتی ئــەوی بەرکەوتبێ ،لــە کۆتاییــدا حاڵــەتێك لــە نــەبوونی و خــەم بــاڵی بەســەرمدا کێشــا. دەنگــی موسیقایەکی کۆن تێکەڵ بــە دووکــەڵ بــوو، بەپــەرداخی بــەتاڵ و جــێ هێڵــراو نەمــدەتوانی هــیچ بکــەم، پەرداخــە کۆنیباکەکــەش کــە گەرســۆنەکە لەبــەردەمی دانــا، ئــەنجامی بــێ پــەروایی و ئارەزوویــەك بــوو کــە ئاوهــا نەمێنمــەوە .ئــازارم هــەبوو... نــەء... شــتێکی دیکــە لــە ســنگمدا جــۆش دەدا، لەوانەیــە حــەزکردن بــێ بــەگریان... پــێ بکــەنن ،گــوێ نادەمێ.

مێردەکــەی لــە تەنیشــتی دانیشــتبوو. هــەردوو منداڵەکەشــی بــە دەوریانــەوە یارییــان دەکــرد، مێردەکەبێــدەنگ بوو،بێتاقــەت و بێــزار تەماشــای دەوروپشــتی خــۆی دەکــرد. بــەخۆم گــوت بــۆ وا دانیشــتووە؟ بــۆ قســەیەك ناکــا؟ بــۆ باوێشــك نــادا؟ بەکینــەو شــێتییەدەگوتم: ئــەی ئــەو کابرایــەی توانــای شــادیت نییــە. جنێــوی بــدەرێ.. دەســتی بگــرە.. تەماشــای چــاوی بکــە، بــەڵام ئــاوا وەك لاشــەیەکی لــە خاچــدراو ،بــێ ئەمــەیان کەس لێت قبووڵ ناکا.

نــازانم بــۆ چــیتر نــەمتوانی دانیشــم. بــە تووڕەییــەوە هۆڵەکــەم بــەجێ هێشــت. لای دەرگــا ســوڕاوەکە لەگــەڵ پیاوێکــدا لەیــەکمان دا، زۆر شــەرمەزاربووم، بــیرم بــۆ ئــەو بــێ پەرواییــە چــوو، کــە لــە دەم و چــاومەوە دەردەپــەڕێ ، لــەوەش زیــاتر کــە کەســێ بتــوانێ بەرگەی بگرێ.

چــاوەکانی وەك دەزووی ئاوریشــم هاتنــە بەرچــاوم ،کــە دەمبەســتنەوە، کــە ســەرم هــەڵبڕی داوای لێ بــووردن بکــەم، ئــەو پێدەکــەنی ،ئــەو پێکەنینــە بچــووکەی لــە لێبــوردن

دەچوو پێ بکەنن.. دەڵـێن هەرزەکارییـە؟ لەوانەیەسـێ سـاڵان بـووم.. سـەد سـاڵان بـووم.. گەورە بووم.. بچووك بووم.. پەیوەندیم هەبوو.

سـێ سـاڵە مـن و مـیرا لێـك جیانابینـەوە ، زۆر ناخۆشـیمان بـوو ، بـەڵام رازی بووین،لـەو جارانـەی ناخۆشـیمان بـوو. زۆر لـە مـیرا م بـورد، بـەڵام ئـەو زیـاتری لـە مـن بورد.

ئـەم (مـیرا) یـەی کـە بۆتـانی بـاس دەکـەم سـپیکەلانەیەکی بـاڵا بـەرزە ، چـاوەکانی قاوەیین ،لەشیشی ئەوەندە جوانـە تـا ئـەو رادەیـەی هەرکەسـێ دەیبینـی لەگـەڵ مـن دەڕوا بە غیلیان پێ دەبردم. لەوانەشـە بـە دزییـەوە جنێویشـی پێـی دابـێ... بـەڵام مـیرا گـوێی بەهیچ نەدەدا. جیهانێکی سەیر بـوو ،هـەر لەبەرئـەوەش مـن خۆشـم دەویسـت، حـەزی بـە وەرزش و شیعر بوو، هـەرباس باسـی ئـەو دوو شـتە بـوو لای ئـەو، زۆرجـار لۆمـەی منـی دەکرد، چونکە خۆم بـەو جـۆرە ئیهمـال دەکـرد و پێشـبینیی ئـەوەی کـرد، کـە مـن پـێش ئـەوەی بگەمـە چـڵ سـاڵ دەمـرم. کـە جارێکیـان نـەخۆش کـەوتم زۆر ترسـاو بـەدیار سەرمەوە هەر خەریکی گریـان بـوو، تـاوام لێهـات گومـانم لا پەیـدابێ کـە مـەرگم نزیـك بووەتـەوە. کـە چـاك بوومـەوە و دەرکـەوت ئـەوەی تووشـم بووبـوو تووشـی زۆر کـەس دەبـێ. ئـەو هـەر وازی نـەهێناو لۆمـەی دەکـردم و وشـەی زۆر رەقـی پـێ دەگـوتم و ئاماژەشـی بـۆ زەردی چـاوم و دەرپـەڕینی دەمارەکـانی لاملـم دەکـردو گـوتی مـن " تووشی غـدە بـووم و دکتـۆر بەمـەی نـەزانیوە" کـە بڕیـارم دا بچـم بـۆ شـاخ ئیسـراحەت بکەم هیچ جۆرە نارەزایی و بێـزاریم لـە چـاویدا نـەبینی، هەڵـەش ناکـەم ئەگـەر بڵـێم ئـەم بڕیـارەی پـێ خـۆش بـوو ، چـونکە "کـەڵکی دەبـێ بـۆ تەندروسـتیم بەتایبـەتی ئەگـەر وەرزش بکەم، هـەر وەرزشـێ و دوریـش دەبم لـە کـەش و هـەوا خنکێنەەرەکـەی شـار ،کـە مرۆڤ تووشی شێرپەنجە دەکا."

مـیرا بەوەشـەوە وازی نـەهێنا ،بـەڵکو جۆرەهـا خـواردنی "بەکـەڵك و پێویسـتی" بـۆ ئامـادەکردم. کـە دەڕۆیشـتین بـۆ وێسـتگەی شـەمەندەفەرەکە سـووربوو لەسـەر ئـەوەی کاڵەکێکی سەوزی گەورەم بۆ بکڕێ.

ئاماژەی بۆ کاڵەکەکە کردو گوتی : دڵم ئاوها گەورەیە.

زۆر مانـدووبووم لـە هـەڵگرتنی ئـەو کاڵەکـە لـەم شـەمەندەفەر بـۆ ئـەو شـەمەندەفەر پاشـان بـۆ پـاص ، پێتـان سـەیر نـەبێ گـەر بڵـێم کاڵەکـە لەعنەتییەکـە لای دەرگـای

ئۆتێلەکـە لەدەسـتم بەربۆوەوکەوتـە سـەر ئـەرز و شـکا زۆر شـڵەژاندمی و پێکـەنینی بێدەنگم لە چاوی ئەو خەڵکەی دەوورپشتی خۆمدا بینی.

تـازە لـە نەخۆشـی چـاك ببوومـەوە و چـوونە شاخیشـم زۆر لا مەبەسـت بـوو، مـیرا سـوور بـوو لەسـەر ئـەوەی مـاوەی " النقاهـە – پێویسـتە.. بەشـێکە لـە چارەسـەر" و زۆری لاسەیر بوو ، کە نوژدار ئاماژەی بەوە نەدابوو.

تـەنها مـیرام نەدەناسـی، لـە هـەمان کاتـدا لەگـەڵ پـاولا پەیوەنـدیم هـەبوو، پـاولا ئافرەتێـك بـوو لـە جـۆرێکی دیکـە: سـادە، راسـتگۆ، رقـی لـە مۆسـیقای خـەمباری و فەلسـەفەیە. (پـاولا فەلسـەفە دەخـوێنێ) زۆر جگـەرە دەکێشـێ ،ئەمـەش لـەو ئـاغزە جگەرانـەوە دیـارە کـە سـووراوی پێوەیـە و لـە هـەموو لایـەکی ژوورەکـە و حەمامەکـە بڵاوبوونەتـەوە ، پـاولا رقـی لـە خواردنـەوە بـوو تـارادەی سەرخۆشـی پاشـان گریـان و هەمیشە کاتێکی زۆر خۆش و جوان و خەمبارمان بەسەردەبرد.

پـێش مـیراو پـێش پـاولا، پـاولای سـنگ گـەورەی مـەمك رەق کەڤـەت بۆنەخۆشـەکەیم لەبیرناچـێ. پـێش ئـەو دوو ژنـە و دوای ئـەوانیش ژنـی دیکـەم ناسـی. بـەڵام لـەو هاوینـە نەفرەتییـەدا بـووم بـە مرۆڤێکـی دیکـە ، ئەگـەر یـەکێ منـی دیتبـا لـەژێر باڵکۆنەکـەدا وەسـتاوم و لـە پشـت جامەکـەوە چـاودێری ئـەو جیهانـە سـیحرییە دەکەم ،کـە بـۆم رەخسـا ، ئەگـەر یـەکێ منـی دیتبـا کـە دەمارەکـانم شـل بـوون و وەکـو بەندۆڵیان لێهاتووە. دەیگوت جۆرێك شێتایەتیم تووش هاتووە.

هەرزەکار؟ بـەڵێ مـن "تحـدی" اتـان دەکـەم بڵـێن وانـەبووم، ئەگـەر بتانـەوێ شـتێکی دیکـە بڵـێین سـەبارەت "بـێ بەشـی – الحرمـان" ئەوسـا هەڵەیـەکی گـەورە دەکـەن. مـن وەك پەپوولە ئەم ژن و ئـەو ژنم نـەدەکرد، بـەڵام بـێ بـەش نـەبووم ،ڕانم دەگـرت لـە نێـوان دەسـتمداو رامدەوەشـاند بـۆ ئـەوەی گیـانم پـڕ بـێ لـە شـادیی دەسـکەوت و سـەرکەوتن پاشان دەسـتم دەخـزا وەك مـار، بـۆ لای سـنگ لـەوێ لێـی دەگـەڕام بەسـەر مەمکەکانـدا بگـەڕێ. ئـەوجا پشـتەوە ، لەویشـەوە دەخـزا بـۆ سمـت و لەناوەوەمـدا دەنگێـك وەك فیشکەی مار هاواری دەکرد تێربە.. دەبێ تا ئەو رادەیەی دڵت هیچ نابا..

جـا ئەگـەر لـە نێـو ئێـوەدا زانایـەکی کـوێر هـەبێ، ریشـی وەك تـەونی جاڵجاڵۆکـە وابێ، ئەوسا ئەو دەڵـێ ئـەم حاڵەتـە دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەردەمی منـداڵی ، بـێ بەشـییە ، بێ بەشییە لە سۆزی دایك، بەڵێ دایکم من منـداڵ بـووم کـە مـرد، بـەڵام ئـەم زانایـە کـە

دەمــی وەك بــۆق دەكاتــەوەو وشــەی زل و نادیــار بەســەر خەڵكــدا دەبــارێنی شــتێكی زۆر گــرنگ و بنــەڕەتی نییــە ،كــە گەوهــەر مــرۆڤ و پەیوەنــدیی زایەنــد پێكــدێنی. ئــەویش خۆشەویستییە.

سۆز... لەتەمــەنی شــەش ساڵێدا دایكمـم لەدەسـت بچـێ. بكەومـە نـاو ئـەم دنیایـە بـێ ئــەوەی بـزانم بۆتاكـەی.. لەسـەر هـەموو شـتێكی رابـووردو وبـژیم. ئەگـەر زمـانێكی كوێریش بێ... لە هەندێ حاڵەتی دیكەدا تەنها خەون.

دەكــرێ هەرشــیكردنەوەیەك لــە حاڵــەتی مــن بكۆڵێتــەوە و دەگاتــە شــتی زۆر، بــەڵام دڵنیــام ئــەوەی مــن خــۆم لەناویــدا دەبیــنم لــە هــیچ خۆشەویســتی بــێ مانــادا جێــی نابێتەوە، كە ئێستا لەسەر رقانەوە دێتەدەر.

كـە لـە هـۆڵی ئۆتێـل چـوومەدەر بڕیـارم دا بچـمە لای رادمـیلا، رادمـیلا بۆچـی لـەو ســاتەدا لێــوی خــۆت دابــووە ئیڤــان؟ بڵــێ.. بــۆ خــاتری ئاســمــان شــتێ بڵــێ ،بەشــكو ئیســراحەت بكــەم، ئەگــەر شــتێی دیكــە روویــدابا لای ئێــوە ئێســتا مرۆڤێكــی ئاســایی دەبــووم. دەبــزانن چــی روویــدا: شــەوی پێشــتر شــەڕمان بــوو، بــێ بــەكارهێنانی وشــە یــان دەست یاشتێ كە بڕین دروست بكـات. لەگـەڵ ئیڤانـدا چـەند جـارێ شـەڕمان بـووە. چـوار پیــاو و ســێ ژن بــووی لەناوەنــدی هــۆڵی ســەماكەدا دانیشــتبووین. دەبوایــە یــەكێكمان پارەی شتێكی بـدابا. نـازانم بۆچـی رادەمـیلا چـەند جـارێ منـی هەڵبـژارد تـاكو سـەمای لەگەڵدا بكەم.

پــێش كۆتــایی هــاتنی ســەماكە رێكــەوتین كــە گوێمــان لــە ڤالســی ڤینــا بــوو، ئێمــە لــەناو جێگــە هەناســەبڕكێمان بــوو. بــۆ بــەیانیی رۆژی دوایــی زۆر خــەمبار بــووم، لای نیوەڕۆ بیرم لە یاسای سروشت و ئەسڵی ژیان دەكردەوە.

ئەو وشانەش كە وەڵامــی رادەمــیلام پێیــان دایــەوە، دانــی پێــدادەنێم ، كــە بــێ مانــاو بــوونی ســووكایەتیان لێــوە دەهــات . رادەمــیلا دوای نــانی نیــوەڕۆ بــەتووڕەیی رۆیشــت و بڕیاری دا بە پەلە تۆڵەم لێ بكاتەوە.

ماوەیــەكی زۆر بــوو رادمــیلام دەناســی كــە لــە هــۆڵی ئۆتێلەكــە یــەكترمان بینــی، شــەهوەت لــە چــاومدا دیــاردەبوو، ئــەو یەكســەر ســەری وەك مــایینی راوەشــاند. "دوور بكەرەوە لـێم. تاقـەتی هـیچ جـۆرە كێشـەییێكم نییـە." بـەڵام ئـەو پێكەنینـەی دوای ئـەم وشــانە تەقییــەوە، ئەوەنــدە درووژێنــەر كــە نــەمتوانی بەرگــەی بگــرم. دەســتیم گــرت و

گوشــیم. لێ گــەڕا وا بکــەم و گۆشــتەکەی تــاقی بکەمــەوە پاشــان گــوتی :" کــاتێکی زۆرمان لەبــەر دەمدایــە، لێــرەو لــە شــاریش." کــە رادەمــیلا بــەجێی هێشــتم هەســتم بــە ئیسراحەت کرد.

ڕۆژی دوایــی.. کــە لــە ســەر لمــە نەرمەکــە لــە لێــواری دەریاچــەکە راکشــام. تووشــی حاڵــەتێك بــووم لــە بــێ مانــایی و خــەمباری ، ئارەزووەکانیشــم ،کــە تەماشــای قــووڵایی دەریاچــەکەم دەکــرد نــاروونی وتێکهەڵچــڕژاوبوون. لــەو بارودۆخــەدا لــە بــێ ئــەنجامی و ناڕوونی و پەرتیــدا ڕووبــەڕووی ئــەو تەماشــای کردنــە بوومــەوە، ئــیتر ژیــانم دەســتی کــرد بە لەبەریەك هەڵوەشــانەوە و دارِمــان.. و بــووم بــە نــەفرەت لێکــراو، ئەگــەر رادمــیلا ئــەو ئێوارەیــە دوای بــاران خــۆی بــدابایێ بــە مــن رزگــاری دەکــردم. بــەڵام رادمــیلا چــاوەڕێی نەکرد.

بەپەلە رایکــرد، کــە لێوەکــانی ئیڤــانم بینــی لــە ژێــر دارســنەوبەرەکەدا نزیــك دەرگــای پشتەوەی چێشتخانەکەدا نووساوە بە ملییەوە. وای لێکردم رابکەم بەرەو دەریاچەکە.

دەریاچــەکە دوای بــاران ئاوەکــەی لێــڵ بــوو. جۆگەلــە بچــووکەکان هێشــتا بــەرەو دەریاچەکە دەهاتن و تێی دەڕژان.

ئــەو بەلەمــەی گرتبــووم وەك دڵدانەوەیــەکی هــەرزان لــە دەســتم تــرازا، وەك بڵێیــت رابکا. کــە لەســەر بــەردێ نزیــك پردەکــە رووەو بــاکوور دانیشــتم ،هەســتم بــە خــەم کــرد، دووبارە دایگرتمەوە وەك کۆمەڵە جلێکی قورس.

لــە مێشــکمدا چــاوەکانی بریســکانەوە، چــاوەکانی وەك دەروازەی ســوور هەڵگــەڕاوی دۆزەخ بــوون. لــەبیرناکرێ. بــە دەنگــێ کــە بەزەحمــەت دەبیســترا بــە خــۆمم گــوت:" ئــەی ئەو خوایەی خــۆت لەســەر یــەك دەســت گرتــووە و تەماشــای بەشــەرە نەگبەتــەکان، بۆچــی لێگــەڕایت هــەموو شــتێ بــە رێگــە مەترســیدارەکاندا گوزەربکــا؟" وای بۆچــووم خواخــەوتبێ ، دبتــێ لــە ســاتێکی دیکــەدا هەســتم کــرد بێــزارە. ویســتم قســەبکا بــەڵام نەیکرد.

ئێــوەش، چ وشــەیەك ئێســتا لــە یادەوەریتانــەوە شــۆڕدەبێتەوە بــۆ لێوەکانتــان و دەتانەوێ فرێی بدەنە دەم و چاوی من؟"

ئێمــەی دانیشــتوانی ئۆتێــل زۆربــەی شــەوان بەنــدی هــۆلی ســەما و چێشــتخانەکەین، ئەگەر مانگ لە ئەشکەوتە تۆزاوییــە کــەی هاتــەدەر و وەك تــۆپێکی ســەوز لــە پانایییــەدا

غلۆربـووەوە ، کـە پێـی دەڵـێن ئاسمـان. ئەگـەر ئەمـە روویـدا و فێنکـایی لـە هـەوادا بڵاوبـووەوە و خۆشـی کـرد دەمـاری پیـاوو ژنـەکان تووشـی رەنگێکـی زەرد وەك ژەنـگ دەبـێ. زۆربـەی دانیشـتوانی ئۆتێلەکـە دەچـوونە رێگـە تەسـکەکانی نـاو باخچـە گەورەکەی ئۆتیل ،کە دەگاتـە لێـواری دۆڵەکـە. لـەوێ تونـد دەسـتی یـەکتریان دەگوشـی و وەکو سەگ پێکەوە دەنوسان و یـەکتریان مـاچ دەکـرد. تـا کـە خـوێن جمـا یـان دەیانرژانـە ناو پانتۆڵەکانیان یان وەکو پشیلەی تۆقیو رایان دەکرد بۆناو جێگاکانیان.

بەندییـەکانی ئۆتێلەکـە زۆربـوون، لـە هۆڵـەکان ،لـەژێر دارەکـان و شـەوانەش لەبـەر روونـاکی تیشـکی مانگـدا خۆیـان حەشـاردەدا یـان دەچـوونە ژوورە رازاوەکـان بەوێنـەی دەریاچـە رەنگـاو رەنگـەکان کـە لـە دەوروپشـتیدا ژن و پیـاو پێدەکـەنن و مانـای ئـازار نازانن.

ئەگـەر بـۆ رۆژی دوایـی بـاران نـەباریبا ئـەو گیانـەوەرە بچـووکەی لـەپڕ سـەری بـەرزکردەوەم دەفـەوتا. هـەروەها رادمیلاشـم جـارێکی دیکـە دەس دەکەوتـەوە. بـەڵێ جـارێکی دیکـە بـەجۆرێك لـە جۆرەکـان دەسـتم بکەوێتـەوە.. لەدەسـت ئیڤـانی دەربکـەم. لە باوەشیدا دەکرێ ئەو هەناسـەیە لەبیربکـەم ،کـە تێکـەڵ خـوێنم بـووە، دەکـرێ چـاوەکانم دابخەم و چیتر ئەو چاوانە نەبینم کـە پـڕن لـە هـاوارو پـەرۆش و خـەم. ئـەم شـتە نارِوونـەی ناوی نازانم.. لەوانەیـە خۆشەویسـتی بـێ.. لـە باوەشـی رادمـیلا.. وەك یەکـەمجار دەتـوانم لەبیربکـەم و پـێش ئـەوەی خـەمبارو پەشـیمان خەبـەرم ببێتـەوە، هـەموو شـتێ کۆتـایی دێ. چـاوەکان دەکوژێنـەوە و لـە مێشـکی مـن لادەچـن. بـەڵام پەرۆشـی لەبیرکردنەوەکـە ئـاواتم بـۆ دەخواسـت وەك یـادەوەری خـوای لێهـات: فـراوان ، راکـردوو هەمیشـە ئـازاری لێ دەردەچێ.

ئێسـتا... بـەڵێ ئێسـتا و دوای تێپـەڕبوونی چـەندین سـاڵ ئەگـەر بـاران ببـارێ هەسـت، دەکـەم سـۆزێ رامدەکێشـێ بـۆ ئـەوەی بگـریم. هەسـت دەکـەم دونیـا بچـووکە، گەمارۆدراوە و خەریکە کۆتایی دێت.

لـەوێ بـارانێکی ئەوەنـدە چـڕ بـاری کـە لـە یـادەوەری مرۆڤـدا خـەم و یادگارییـەکانی هەڵـدەکۆڵی ، ئێـوەش دەزانـن کـە خەمـە نـەفرەت لێکراوەکـان پێویسـتی بەکـەس نییـە تـاکو خـۆی لـە کفنەکـەی بێنێتـەدەر. چـاوەڕێ دەکـا.. لـەپڕ لـە سـاتێکدا سـەربەرز دادەوەستێ، وەك بڵێیت چاوەڕێی شتێ بکا تاکو بتەقێتەوە.

هاوینە بارانی نـەفرەت لێکـراو بەندییـەکانی دووبـارە کـۆکردەوە، سـەرەتا لـە سـالۆنی نانخۆاردندا کۆیـانی کـردەوە. پاشـان لـە چـایخانە. لـە چـایخانە منـدالان کردیـان بـە هـەرا، راوەسـتابوون و ناوچـەوانیان نـابوو بـە شووشـەکەوە و بـە ڕقـەوە تەماشـای بارانەکـەیان دەکرد.

لای دەرگاکـان وەسـتابوون چـاوەڕێی ئـەوەیان دەکـرد رابکـەن بـۆ شـوێنی . پیاوەکـانیش لـە جانتاچـەرمپەکەوە (کـە زۆرتـر رەش بـوون) رۆژنامـەیان دەرهێنـا کـە چـەند رۆژێکـی بەسـەردا تێپـەڕیبوو و بەبێزارییـەوە تەماشـای پیتـەکانیان دەکـرد، هـەرجارە ناجـارێکیش تەماشـای بارانەکـەیان دەکـرد، کـە مانـدوودەبوون یـاریی کاغـەزیان دەکـردو پـێش ئـەوەی رۆژ بگاتـە نیـوە پەرداخـە بـیرە بـەخێراییێکی زۆرەوە بلاوکرایەوە.

ژنـانیش بـە شـتی زۆرەوە خۆیـان سـەرقالّ کردبـوو: راکـردن بـەدوای مندالانـدا ، چـوونە ژوورەکان و جل گۆڕین. پاشان دانیشتن بە بێ دەنگ و چاودێریی چالاکی هەموو شتێ.

### خۆشەویستەکەم..

لـەوێ بـوو، پـانتۆلێکی رەشـی تەسـك و بلـوزێکی بـۆر، ناشـزانم بـۆ شـالێکی دابـوو بەسەر شانیا. دلدارەکەم گۆڤـارێکی لەسـەر مێزەکـە دانـابوو ،چـاوی گێـڕا بـە سـالۆنەکەیا دەگەڕا.. ئایا بۆ مـن دەگـەڕا؟ خـۆم هەلدەخەلـەتێنم؟ خـەو ئـەبینم؟ هـەر شـتێکی دیکـە کە دەکرێ بیلێین؟

بـاران بـەخوڕ دەبـاری و کتێبـێکم لەبـەر دەسـتدابوو نەمـدەتوانی دایخـەم، هـەروەها نەشمدەتوانی دێرێکی لێ بخوێنمەوە.

رادمـیلا؟ رادمـیلا لـەوێ بـوو خـۆی گرمۆلـە کردبـوو، لەتەنیشـت ئیڤـان دانیشـتبوو، ئەوەنـدەش لەیەکـەوە نزیـك بـوون خـەریك بـوو بەیەکـەوە دەنووسـان. وەك دووعاشـق بـە چیە قسـەیان دەکـرد، سـەیری لای منیـان نـەکرد، تەنانـەت کـە لـە کـاتی نـان خواردنـدا سلاوم لێ کردن پێیان ناخۆش بوو ، بەتایبەتی ئیڤان.

ویسـتم بـۆ بـێ تاقـەتی شـەترەنج بکـەم، بـەلام هـەر سـێ پاکـەتی شـەترەنجەکە گیرابـوون، کـوڕە دەم گەورەکـە پیـاوانی لـوول دەدا، کـە وەکـو پشـیلە بەدەوریانـدا و سـووڕایەوە، بـەلام لـە نزیـك دانیشـتم و چـاوم بڕییـە یاریکـەرەکان ، تـرس دایگـرتم، بـێ

دەسەڵات دانیشتم و بەقەد ئەو جارانەی کە هۆڵەکە پڕدەبوو لە پێکەنینی ئەو کوڕە دەم گەورەیە ، کە وەك پشیلە دەسووڕایەوە من دۆڕام.

لەپڕ سووڕامەوە دوای یارییەکی رواڵەتییانە کوڕە دەم زلەکە ویستی لە کۆتاییدا وای پیشان بدا، کە دۆڕاندوویەتی .بەڵام لە دوا یاریدا بردییەوە و پێکەنینەکەی بەرزبووەوە ،کە وەرچەرخام بۆ ئەوەی دانیشتنەکەم بگۆڕم چاوم پێی کەوت نزیك زۆر نزیك بوو ، هەستم کرد خەریکە ئەخنکێم ، لەناخی خۆمەوە بەدەم ئازارەوە هاوارم کرد " ئەی دایکی زەویی بە پیت، ئەی ئەو گڕەی بەرد دەمسوتێنێ." بڕۆ... ناتوانم ئەوەندە نزیك بی بتبینم ،شادمانی ئەوەنیم." بەترسێکی پڕ لەخەم خۆم کێشایەوە و هەناسەم هەڵکێشاو بڕیارم دا سەیری چاوی بکەم.. هەستم کرد هێزێکی شێت لە خوێنمدا پالی پێوە دەنێ و رایدەگرێ.. پاشان دوای ساتێ هەستم بەو نوێنە نەرمە کرد دامدەپۆشێ. چاوم نوقاند، بۆنەکەی هەموو لەشمی پڕکرد، وەك رەشماڵێکی سەوز بوویە سەرمەوە، کە بیرم کەوتەوە کەی هات هەستم کرد مەودای دەوروبەرم لە ساتێکی دیاریکراودا فراوانترو سپیتر دەبێ، تەنانەت هەموو زەویی داپۆشی، پاشان هەستم کرد بە شتێ کە لە فێنکییەوە نزیك بوو دادەباری و تیژ وەك ئازار وابوو. دڵنیابووم کە لەو ساتەدا هات.

کە کورسییەکەم جووڵاند بۆ ئەوەی داوای لێ بوردن بکەم و رێ بدەم قاچم بەر قاچی کەوت، قاچم کێشایەوە، تەماشای کردم ،لەدەم و چاویدا زەردەخەنەیەکی بچووکی بێ رەنگم دیت ،پاشان وەرچەرخاو رۆیشت.

ئێستا دەبینم. نزیك وەك گلێنەی چاو، یەك پارچە رووناکی بوو، خۆشی بوو، ئای لە وشە چەند بێ کەڵك و بێ دەسەڵاتە. خۆزگە تووشی لاڵ بوونی گشتی دەهاتم و دەخنکام، خۆزگە رادمیلا چەند رۆژێکی تریش بۆ من بە وەفادەبوو. ئەگەر خەم ئەو بەیانییە بەسەرمدا زاڵ نەبایە، رادمیلا لەگەڵم دەبوو، ئێستا بە گوێرەی ئێوە براوەبووم، بەڵام ئیڤان رێوییە ماندوونابێ. هەرکە دەبینێ یەکسەر دەوری دەدا، ئەویش بەپەلە خۆی دەدا بە دەستەوە بۆ ئەوەی من بکوژێ.

پاشان بەیەکەوە رایان کرد، کە رادمیلا رای کرد بە چاوی خۆم چالاییەکم بینی قووتم دەدا، نەمتوانی بەرگری بکەم، پاشان ترسام.

ئـەو زەردەخەنــە بچــووكە خــەمبارەی دەوری دام وایكــرد زەوی قــووتم بـدا.. ئـاه ئـەو زەردەخەنەیــە بــە چــەند عــەزابی زۆرە، گــرژو تۆقیوبــوو، منــیش چــی بــەبیرو بۆچــوونم دەڵێی بڵێن، چونكە لەسـەر پشـتی خـۆی لـە مـن ترسـنۆكتری هەڵنـەگرتووە، لـەو سـاتەدا بریتـی بـووم لـە كەروێشـكێكی پشـت چـەماوەی نـەفرەت لێكـراو. لـە سـێبەری دارەكـان دەترسـام. لــەدەنگی بــا.. ئێــوەش خەڵكینــە دەبــێ ســەدان دارم لێ بــدەن، رەحمــم پــێ مەكـەن. مـن شـایانی رەحـم نـیم، تفـم لێ بكـەن. ئەگـەر وشـەیەكم گـوتبێ یـان قـاچ لێ خشانێكی دیكـە زەردەخەنەیـەكی ئـازا... ئـاه لـێم گـەڕێن زیـاد لـە توانـای خـۆم ئـازارم چەشـت.. ئێسـتا و دوای تێپـەڕبوونی چـەندین سـاڵ ئەگـەر بـاران بـاری... ئەگـەر بـاران نەباری من ئازار دەچێژم.

دەسـتی خسـتە سەرشـانی. راچـڵەكی ،بەترسـەوە ئـاوڕی دایـەوە، دەموچـاوی وشـك بـوو و هەنـدێ مـووی سـوور كـە ئـەنجامی خـوێنی ناخیـەتی و تـەواو نـابێ ناوچـەوانی دادەپۆشـێ ، هـیچ ئـارەزوو یـان ئاماژەیـەكی تێـدا نـەبوو ، كـە هێمـای شـتێ بـێ. لەسـەرخۆ وەك پشـیلە لەتەنیشـتییەوە رۆیشـت. گـەردوونێكی سـەوز منـی پێچـایەوە ،بـووم بـە گیانـەوەرێكی تۆقیـوی گـەمارۆدراو كـە نـاتوانێ تەماشـای چـاوی كـەس بكـا. هەناسەبڕكێم بـوو كـە دەمویسـت هەناسـە بـدەم.. دەنگـەكانیش ئەوانـەی نەبیسـراون. لـە ناخمـدا شـەپۆلیان دەدا و خۆیـان دەكێشـا بـە دیـواری سـنگمدا و دەنگێكـی گـەورەی پـڕ ئـازاری لێ بـەرزدەبووەوە. كـە رۆیشـت بـە خـۆمم گـوت:" خۆزگـە دەمتـوانی بەیـەك زەردەخەنە وەڵامی بدەمەوە."

خـۆم واپیشـان دا گوایـا تەماشـای یاریكـەرەكان دەكـەم ،بـەڵام هیچـم نـەدیت. كـە دووركەوتــەوە ئازابوومــەوە تەماشــام دەكــرد بەدوایداچــووم، لەناوەڕاســتدا دەڕۆیشــت مێردەكـەی لای راسـتییەوە هـەردوو كوڕەكـەش لای چـەپییەوە پێیـە بچـووكەكانی كـە دەڕۆیشـت لـە هـەموو هەنگاوێكـدا پـێ دەنایـە سـەر دڵـم و بـەناو خوێنمـدا دەڕۆیشـت، رایدەكرد ، هەستم بە نیعمەت و خـەم كـرد ، لـەتاو ئـازار هـاوارم كـرد:" ئـەی خـوای بـە تواناو گەورە تۆزێ هـەوام دەوێ بـۆ ئـەوەی نـەخنكێم." لـەو گۆڕەپانـە چـۆڵە لەگـەڵ هـەر هەنگاو هەڵهێنانە وەبێك هەستم دەكرد خوێنم خەریكە لەلامل و چاومەوە دەرپەڕێ.

رادمـیلام لـەبیرە، ئیڤـانم لـەبیرە و بـەدەنگێكی لـەرزۆك پێیـان دەڵـێم. ئـەم خراپـە كارییەتانم قەت لەبیرناچێ. ئەگـەر رادمـیلا ئاگـای لـەو ئـازارە بوایـە ،كـە لـە سـنگمدایە

ئەوسا خەمەکەمی بە لاوە گرنگ نەدەبوو و لێی دەبووریم، بەڵام لووتبەرزانە کە بەجێی هێشتم گوتی:

جارێکی دیکە تەورات لەگەڵ خۆت هەڵگرە و لەسەر گۆڕەکانی گوندی دراوسێمان بیخوێنە.رقم لە خەمە رادمیلا ، قەت حەزم لێ نەکردووە ، ئایا ئەتوانی پیاوێ بدۆزیتەوە لەسەر ئەم زەوییە بژی و حەزبکا خەمباربێ؟"

دەمویست ئەم قسانەی پێ بڵێم ، کە بە مێشکمدا هات ، بەڵام دوایی رام گۆڕی و بێدەنگ بووم. رادمیلا تەماشای کردم ،کە بینی بێدەنگم ، سەری راوەشاند پاشان گوتی:

-دە رۆژ لە شاخ ،بەتەنیشت دەریاچەوە پاشان دەگەڕێتەوە سەر خوێندنکار کردن.. دەبێ لەبیرخۆمانی ببەینەوە. ئەی تۆ... تۆ بۆ ناتەوێ لەبیرت بچێ؟"

هیچم پێ نەگوت ، ئێوەش ناتوانن هیچ بڵێن پێ بکەنن رابوێرن پێ بکەنن، بەڵام بێ ئەوەی من بتانبینم. چونکە ئەگەر دەنگتان بەرزبووەوە ئەوسا وەك ئیبلیس جوێنتان دەدەمێ و پێتان دەڵێم : هەی بەرازەکان ئێوە دڵتان نییە ، ئەی ئەو کەسانەی دایکتان میزی پێداکردن بۆ ئەوەی دومەڵەکانی سەرسنگ و دەم و چاوتان چاك ببێتەوە.

هەر بەوەندە وازناهێنم بەڵکو زیاتر دەڵێم. ئێوە ئەی مل بەست ، رۆژێ بەو ملبەستانە دەتان خنکێنم ، رەحمتان پێ ناکەم .دەتانەوێ رەحم بەکێ بکەم. سنگە بەتاڵەکان، بەئەو سنگانەی پڕن لە بوغزو کینە؟ ئێوە مەترسن وەك وەحش رەفتاردەکەم.

رادمیلا ئەی تۆ، بریا ئەو شەوە قەت تەواو نەدەبوو ئەگەر توانای گا یا ئارەزووی سەگم هەبا ئێستا وەك پشیلەیەکی کلك بڕاو لەلامەوە دەبووی. ئەو شەوە کورت بوو. پڕبوو لە خەم، منیش گایەکی پیری دۆڕاو. زوو ماندوو بووم. ڕاکشام .بۆ بەیانی تووشی خەم و پەشیمانی بووم. منی پێ "تحمل " نەکرا رادمیلا بەجێی هێشتم، ئێستاش کە دەرگاکە دەبینم خۆشەویستەکەم ئاو دیو دەکا و چیتر نایبینمەوە پەنجە ئەخەمە چاومەوە و زۆری لێ دەکەم، نەمدەویست هیچ ببینم. چیتر لێرە نییە. رۆیشت.

بۆکوێ رۆیشت؟ چوو جلەکانی داکەنێ؟ ئایا ئێستا لەبەردەم ئاوێنەدا وەستاوە بۆ ئەوەی جلی تازە هەڵبژێرێ؟ ئایا دەتوانێ بۆیەك ساتیش بێ چاوی لێ خافڵ بکات؟ چۆن دەتوانێ بهێڵێ یەك چرکە تێپەڕێ بێ ئەوەی بۆنی عەترەکەی نەکا، بێ ئەوەی دەم و چاوی بەلای قاچیدا نەسووێ؟

تۆش ئەی خوا تۆش کە باوکە پیرۆزەکانت راسپاردووە دان پیانان وەربگرن. دەبایە شتێکی دیکە بکەی... شتێکی باشتر فەرمان بەمانە بدەی کە، بۆساتێکیش ،تەنانەت لە کاتی "قداس" یشدا واز لە گوناه ناهێنم دەبایە فەرمانیان پێ بکەی بێدەنگ بن... و بۆ ماوەیەك بێ دەنگ بوەستایتایە تاکو توانات جوانتر دەرکەوتایە، بەرادمیلا بڵێی"شتێ لەخەم خۆراکی دڵە" یان بە تاڵە موونەی سەر دەم و چاوی بڵێی " ئەم پەپوولەیەی ئازاری دڵ دەدا واز لێ بێنە. لێی گەڕێ با ژیان بە مۆسیقای خۆشی نەخشێنێ ." بەڵام تۆ ئەی خوا، دڵێکی ئازات نەدامێ، بۆچی قبووڵت نەکرد ئەگەر بۆ یەك جاریش بێ دڵم ئازابووایە؟

ئایا لە ژوورەکەیدا یەو دەگری؟ بیردەکاتەوە؟ بۆچی بەو جۆرە خەمبارە؟ پێم گوت " بۆچی خەمباری ئەی شابانووی دڵم تا هەتا هەتایە"... کە بینایم بەو جۆرە خەمبارە هەستم بە گڕی خەم کرد دەمخنکێنێ و بێ ئومێدییەکی رەش سەرو دڵی گرتم ، کە بیرم لەوە کردەوە مرۆڤ دەکرێ بەو جۆرە خەمباربێ.

لەکاتێکدا "نازانم کام کات چونکە گەلێ شت بە مێشکمدا تێپەڕین." بەتەنیا هاتە هۆڵەکە لەو هۆڵەدا هەر هەردووکمان بووین. تەنیا بووین ، هەستم بە ترس کرد، دەستم بەلەرزین کرد، چەند وشەیەکم بەبیرهاتەوە کە جارێکیان لەسەر گۆڕێك نوسرابوو، تەماشام کرد خەمبار بوو چاوی تێ بڕیم و پێی گوتم: چیت دەوێ؟ بەڵێ وای گوت ،بەشێوەیەکی دیلکەر و وێرانکەر لەپێشتر زیاتر ترسام. گرمۆڵە بووم ،خۆم دا بەسەر کورسییەکدا بۆ ئەوەی وردو خاش نەبم. کورسییەکی دیکە لەو بزاڤە بێ مانایەی سەرکەوت، دەنگەکەی خوێنی دەهەژاند، بەڵام ئەو زەردەخەنەیەی ویستی بەسەر خوارکردنەوە بیشارێتەوە هەموو شتێکی کرد بە بابەتی تەقینەوە دانیشت. لە شوێنێکی دوور دانیشت. منیش بە پەشۆکاوییەوە تەماشام کرد سەری راوەشاند وەك بیەوێ شتێ بکا یان گۆرانییەك بڵێ ، دەمویست لە چاومدا هەڵی گرم. ئەو لە شووشەکەوە تەماشای دەکرد و بیری دەکردەوە، جگەرەیەکی دەرهێنا لە جانتاکەی

بۆنی تووتنەکەی کرد... ئاه  ئەو خۆرە لە دەستمدا ببوایە بە پشکۆ، ئەگەر بۆ یەك جاریش ئەوە روویدابایە جگەرەکەم بۆی دادەگیرساند.. دەمویست لەناو بچم. بتوێمەوە بۆچی لێی نزیك نەبوومەوە؟ بۆچی هێشتم جگەرەکە داگرسێنێ و چەرخە زەلیلەکەش لە گیرفانمدا وەك تەرمی کۆترێ کەوتووە؟ چەند جارێ پێش ئەوەی دایگیرسێنێ تەماشای کردم، وامزانی شقاتەی نییە ، کوێربووم، ترسنۆك بووم، ئێوەش ئەی باوکە پیرۆزەکان. ئایا لە پیاوی ترسنۆك دەکۆڵنەوە.

لەدڵیدا هیچ ئارەزوویێکی خراپ نییە. دەیەوێ جگەرەیەك بۆ ژنێکی خەمبار داگیرسێنێ و ناتوانێ؟ دەبێ شتێ بڵێن ئەو دان پیانانەی لە یادەوەریتاندا کەوتووە ناتوانێ تاڵە موویێەك لە عەرشی خوا بلەرزێنێ.

هەموو شتێ لەلام بێ مانابوو.

لەپڕ هەستام. نەمتوانی تەماشای بکەم. هەستم کرد بە چاوی گەمارۆم دەدا و بەدوامدا دێ. بەلام دەمارەکانم هەموو رەق بوون، نەمدەتوانی جگە لە پێشەوە سەیری هیچ لایەك بکەم. لە ساتێکدا چیترم نەدی.

لەئاو دەستەکەکە نازانم بۆچی چوومە ئەوێ، هیچم نەکرد چەرخەکەم فڕێ دا و دەرچووم.

بارانی هاوین بوو، بەلام ئەمجارە زۆری و هێزی پێشووی نەبوو و هەر بریتی بوو لە ئاو پرژێن. لە ئوتێلەکە زۆر دوورکەوتمەوە، پاڵمدا بەدارێکەوە و گریام، بۆ یەکەمجار پاش چەند ساڵێ دوورو درێژ دەگریام.. چی دەڵێن بیڵێن. خراپترین شت.. دڵم گریا دڵم وەك منداڵێك دەگریا بێ ئەوەی بزانێ بۆ؟

ئێوەش.. گەورەکان.. بەتەمەنەکان.. بەرێزەکان.. لەخۆباییەکان.. گاڵتە بە دڵم دەکەن، چونکە گریا؟ گرنگ نییە بەلامەوە، رۆژێ لە رۆژان تۆڵەتان لێ دەکەمەوە. لەکاتێکدا (نازانم کەی بوو، ئەوە شتێکی سەیرە) سێ جووتیار تێپەڕین، بە یەکێکیانم گوت پییێکی بەدەمەوە بوو.

-من تووتنم هەیە.. تووتنی باش.. لەبری ئەو تووتنە شەرابی باشم دەوێ. شێوازی قسەکردنەکەم خۆش بوو یان بۆ ئەوان وابوو، پێکەنین، بە خۆشەویستییەوە تەماشایان کردم، یەکێکیان گوتی :

- لەگەڵمان وەرە و بوتڵێکی گەورەی شەراب وەرگرە تووتنیشمان ناوێ.

- توتن یان هیچم ناوێ.

بێدەنگ سەریان راوەشاند و ڕۆیشتین، زۆربەی کات بێدەنگ بووین، بەڵام پێش ئەوەی بگەینە گوندەکە یەکێکیان دایە قاقای پێکەنین، بەبێ هۆ، بۆیە ئەوانی دیکە سەیریان پێ هات و تەماشایان کرد، پاشان ئەوانیش پێکەنین، ئەوەی یەکەمجار پێکەنی گوتی و لە جاران زیاتر پێدەکەنی.

- جارێکیان پیاوێکی رەشم نزیك بازاڕەکە بینی زۆر خەمبار بوو، داوای کرد لەبڕی پێلاوەکانی شەرابی بدەمێ. قبوولم نەکرد، بەڵام بەرامبەر شتێکی لەوە گرنگتر شەرابەکەم دایێ.

یەکێکیان بەپەرۆشەوە لێی پرسی:

- چیت لێ سەند.

گوتی :

-شەو بیرو بۆچوونەکانیم لێ سەند، دەیویست بۆ ژنێ خۆی بکوژێ. بەڵام شەو کە خواردمانەوە و گۆرانیمان گوت و پێکەنین، زۆر پێکەنین، کابرا دەستی کرد بە گریان و جنێوی بەخۆی دەدا. بۆ بەیانی بیری لە هیچ شتێ نەکردەوە جگە لەوەی لە دەستمان رابکا.

کە گوێم لە چیرۆکەکە بوو راوەستام.. ئەوانیش وەستان..

بەسەرسوڕمانێکەوە سەیریان کردم.

گوتم:

- هیچم ناوێ

کە دوورکەوتمەوە قسەی ترم گوت، وابزانم گوێیان لێ نەبوو. گوتم:

"ئێوە پیاوێکن دڵتان مردووە... مانای خۆشەویستی نازانن.."

یەکێك لە سێ پیاوەکە رای کرد بە دواما.. هێشتا مابووی بگاتەلام گوتی :

-وەرە رۆڵە... چیت ئەوێ لای ئێمە هەیە... شەراب، خۆشەویستی.

خەمبار دیار بوو... گوتم:

-گاڵتەم ئەکرد.... هیچم ناوێ.

سەرەتا تێنەگەیشت، تەماشای دەکردم، بەڵام نەیدەبینم، دڵنیابووم کە خەمێك دڵی ئازار دەدا، جگەرەیەکم دەرهێنا.. دامگیرساند.. دامێ، بێدەنگ وەریگرت و سەری راوەشاند. کاتێ خۆم ئامادە دەکرد بۆ رۆیشتن، پێم گوت:

-باشتر وایە بگەڕێمەوە.. باشتر وایە تۆش بگەڕێیتەوە.

بەبێزارییەوە سەری راوەشاند.. دەستی بەرزکردەوە کە دەچووم بۆ ئۆتێلەکە بەخۆمم گوت: ئەی باوکە پیرۆزەکان وەرن گوێ لە دانپیانانی پیاوێکی خەمبار بگرن، زەوی پڕ لە پیاوی خەمبار.. تائێستا هەر گوێتان لە دان پیانانی ئەوانە گرتووە،کە هەڵەیان کردووە، بەڵام ئەوانەی هەموو ساتێ دەمرن، ئێوە نایانناسن، تەنانەت ئەوەی ئاسمانیش لەو ئازارو خەمە بێ ئاگایە، کە خەمبارەکان بە دەستییەوە دەناڵێنن... ئەی ئەگەر ئەزانێ بۆچی ئەم برە زۆرەی لە خەم خەڵق کردووە.

کە گەیشتمە نزیك ئۆتێلەکە ئاوڕێکی دواوەم دایەوە، پیاوەکانم نەدی.. رووناکی گوندەکە کزوماندوو دیار بوو، وەك بڵێیت لە ناو ئەشکەوتێکی پڕ لە رق و کینەوە دێتەدەر.

تاسەعات نۆ خەوتم.. شەو بە زەحمەت جێگەیەکم لە هۆڵەکە دەسکەوت. غەریبێکی زۆر هاتبوون، بەڵام ئەو دیارنەبوو. تۆ بڵێی هاتبێت؟ یان زوو رۆیشتبێت؟ ئایا هێشتا خەمبارە؟ دەشێ بە برسیەتی خەوتبێ؟ ئەو... ئەی ئەو کوا؟

غەریبەکان... رادمیلا و ئیڤان.. ئەو شەوە زۆرم خواردەوە.. کچێك ویستی لەگەڵم دانس بکا؟ کاتێ کە نۆرەی ژنان هات بۆ داواکردنی سەما. پێم گوت:

- دڵم پڕە لە خەم... رەنگە دانس بکەم، بەڵام ئەگەر یەکێکی دیکە لە بری من بدۆزیتەوە ئەمشەو بەخۆشی دەیبەیتە سەر.

بەچاوێکی سووك تەماشای کردم و هیچی نەگوت. ئەوە من نەبووم، کە ئەو قسەیەم کرد. بەڵکو پەرداخە کۆنیاکەکان بوون، کە ئازایان کردبووم.

بەدرێژایی رۆژی دوایی دیارنەبوو، ئەوم بینی و منداڵەکانم بینی، بەڵام ئەو دیارنەبوو.. تۆ بڵێیت خەوتبێ؟ یان خۆی کوشتبێ؟ ئەی چاوەکانی.. ئەو دوو چرایەی بێ پەروایی خوا، هێزو توانای بوون و نەبوونی دەردەخا... کوان؟

بەخۆمم گوت: ئەی ئەو چاوانەی لە تاریکایی ئەو ژیانەی من تیایدا دەژیم تەقینەوە. ئەتپەرستم من لە هەموو مەجوسەکانی سەر زەوی مەجوسیترم. من کە

لــەبیرو بۆچــوونی نائومێدیــدا خنکــابوم. چــیرۆکی عاشــقە بچــکۆلەکانم بیرکەوتــەوە، کــە خۆیــان کوشــت.. کــە ژەهریــان خــواردەوە.. کــە خۆیــان بەپــەت بــەدار زەیتوونەکانــدا هەڵواسی.. مــردن. کتێبــە کۆنــەکان باسـیان دەکــەن، بــە ئــازارەوە باسـیان دەکــەن.. مــن نامەوێ خۆم بکوژم، ناوێرم بیر لەو ئازایەتییە بکەمەوە. ئایا گەورە بووم؟

پێتــانم گــوت هێشــتا هــەرزەکارم.. ئــەی گــەورەکان؟ گەورەبەتەمەنــەکان چــۆن کۆتاییــان هــات؟ تــا لــە مــووە سـپییەکان لەســەریاندا بڵاوبووەتــەوە. چرچــولۆچ بــە هەوەســی خۆیــان لــە دەوری دەم و هەردووچــاودا بڵاوبوونەتــەوە.. ئەوانــە گــەورەبوون.. بەڵام خۆشیان دەویست.. ئایـا خۆیـان کوشـت؟ ئایـا ئەمـەم لـە کتێبێکـدا خوێنـدبووەوە؟ گوێم لێ بووە؟ یـان خـەیاڵ و وەهمـە؟ مـافی ئـەوەتان نییـە لێکۆڵینـەوەم لەگەڵـدا بکـەن. ئەوەی من دەیڵێم راستە و دەبێ ئێوەش بڕوا بکەن.

من.. ئەو هەستە دڵم دەڵێستەوە لەسـەرخۆ و بـە ئـازار، نـاوی چـی لێ نـێم؟ پـەرۆش ؟ خۆشەویسـتی.. بــا واز لــە وشــەی خۆشەویســتی بهێــنین ئەوەنــدە خەتــەرە نــاتوانم "تحمل" ی بکەم، زۆر بـە ئـێش و ئـازارە لەوانەیـە لەبـەکارهێنانیا هەڵـە بکـەم، لەوانەیـە لەسـەر زارم ببـێ بەسـروود، کـە نـابێ بـەو جـۆرە لێ گـەڕێم ئـەوەی هەسـتی پـێ دەکـەم نزیکە لە ئارەزووی گریان.

زانـا کوێرەکـەتان ئێسـتا هـاوار دەکـا: پـێم گـوتن ئـەو پیـاوە پێویسـتی بـە دڵسـۆزی هەیە.

مــن هــاوار دەکــەم بــەرووی ئــەم زانایــەدا، بــە ئازایەتییــەك، کــە دەیترســێنێ هــاوار دەکــەم. تــا ئــەوەی میــز بکــا بەخۆیــدا. مــرۆڤ لــەبیرکراو لــەم شــاخە.. بــارانی هــاوین.. تــەنیایی هەســتێکی پــڕ ســۆز بــۆ مرۆڤــێ، بــۆ ژنــێ.. نــا.. درۆتــان لەگــەڵ ناکــەم.. درۆ دەکــەم، بــەڵام بەقــەد حــەبی بچــووکی دەرمــان، لــەو شــاخەدا ئــارەزووی دەس لــەملانێم دەکــرد. دەســتێکی بچــووکی فێنــك تونــد دەســتم بگوشــێ. دووچــاوم دەویســت تیایانــدا بتوێمەوە تـا نـەمان... ئـەویش ئـەو بـوو، ئەگـەر پێتـان بڵـێم کـە هـزری مـن پاکـە وەك گــەڵای دارەکــانی ســنەوبەر، کــە بــارانی هــاوین شــۆردوویەتی، درۆتــان لەگــەڵ دەکــەم.. بــەڵام مــن بــیرم. بــە لەگــەڵ خــەوتن نــەدەکردەوە. بــیرم لــەوە نــەدەکردەوە کــە ئــەم ژنــە لەبەردەستمدا ببێ بــە رادمــیلا. دەمویســت دەس لــە دەســتی بــدەم. ماچــی بکــەم، ســەرم بخەمە باوەشـی و بخـەوم، ئەگـەر لـەوە زیـاتر بـیرم لێ کردبێتـەوە سـەرم بـبڕن و بیـدەن بـە

سەگەکان... ئێوەش ئەی توندڕەوەکان دەتوانن چی بڵێن سەبارەت بەو بیرۆکە بچووکانەی لەسەرمدا جوولاً؟ تاوان؟ بەڵام کوا تاوان؟ تام ئەم ساتە من نامەوێ؟ وەسیەتەکەی (مەسیح)یش کە ئێوە پشتی پێ دەبەستن ناتوانن بیکەن بە "مقصلە" بەئاسانی سەرمی لەسەر بپەڕێنن، من چاوم نەبڕیوەتە ژنی یەکێکی دیکە، ئەوەی ویستم بریتی بوو لەوەی بۆ ساتێك لەو بەهەشتەدا چاولێك بنێم پاشان بمرم.

رادمیلا، قژی پەرت و بڵاو لە تاریکایی ئێوارەداو بەسەر شانی ئیڤاندا بڵاوبووەتەوە. دوو لێوی ئەستووری ورووژێنەر کە ماچم دەکرد لێوەکانی و ورووژێنەرنەبون، بەو جۆرە لە دواییدا بینیم کە ئیڤانی ماچ دەکرد. بۆ کوێ رائەکەی لەدەس من رادمیلا. شار چاوەڕێمان دەکا، شارو رۆژانی درێژی زستان. لەشاردا دووبارە لێوەکانی دەدۆزمەوە." سەربەرزکەرەوە رادمیلا، تەماشام بکە، مەجوولێ... دەمەوێ هەردوو لێوت ببینم."

من تۆم ناوێ رادمیلا... لێرە ئەگەر دوور بایتایە هەستم بە ئیسراحەت دەکرد.. ئەو پشیلە فێڵبازەی لەناو جلەکانتدا دەخەوێ بۆ ساتێکیش واز لە چڕنووك گرتن ناهێنێ.

ئێستا لەگەڵ ئیڤاندا دووردەکەونەوە. بەڵام بەو رادەیەی بتوانم بیبینم. لەسەر رۆخی دەریاچەکە دەسووڕێتەوە هەر کە دەم و چاوی منی دەدیت یەکسەر رووی خۆی وەردەگێڕا و دادەنیشت و پشتی تێدەکردم.. بەڵام هەر تەماشاش دەکا. لەژێر سنەوبەرە گەورەکەدا و لەنزیك کانیاوەکەوە کورسییەك هەڵدەبژێرێ تاکو بتوانم بیبینم "ئیڤان بڕوانەکەی پشیلەکەت لەدەستم ڕادەکا" بەڵام سوپاسی بۆشتێ" بۆ ئیڤان، بۆ شەهوەت، بۆچیاو دەریاچە، سوپاسی بۆ شتێ کە رادمیلای لێ سەندمەوە."

بەتەنیا مامەوە، هەستکردنی مرۆڤ بەتەنیایی لە جێگەی دیاریکراو و لە کاتی دیاریکراودا هەستکردنە بە خنکان هەست دەکا لە هەموو لایەکەوە ئاو دەوری داوە و بەردێکی گەورەش بەستراوە بە قاچییەوە رایدەکێشێ بەرەو خوار بەرەو قووڵایی. هەست کردن بە خنکان خنکانێکی چڕو گشتی،کە بارانیش باری هەست کردن بە خنکان دەبێتە هەستێکی زۆر زاڵ و ورەشکێن.

ڕۆژی سێیەم ئاسمان ساماڵ بوو، لە بالکۆنەکە دانیشتم هەمان بالکۆنی نەفرەت لێکراو، کە کۆتایی تۆمارکرد، هەتاو تەژی ە لە فێنکی و جوانی، دەریاچەکە هێمنە وەك پارچە ئاسنێکی زۆر قایم و قورس، دارەکانیش دووبارە لە دایك دەبنەوە. سەوزتر.. جوانتر.

کە هات پێدەکەنی بەشانی چەپی پاڵی بەدەرگاکەوە نا، جگەرەکە بە دەستییەوە بوو. شەپقەیەکی گەورەشی لەسەردا بوو، کە لەپووش دروست کرابوو، تەماشای ئەکردن، چونکە هەنگاوێ لەپشت خۆیەوە بوون، کە منی بینی داچڵەکی، پێکەنینەکەی نەما، وەك بڵێیت داوای لێ بووردن بکا.

بەپەلە ڕێگەکەی گۆڕی ئەوانیش لە دوایەوە بوون لای ڕاستییەوە. ئایا مرۆڤ دەکرێ ئەوەندە و تا ئەم ڕادەیە جوان بێ. ئایا یەکێکی دیکە، هەرکەسێك دەتوانێ وەك ئەو بێ؟

باوکە پیرۆزەکان دەفتەرەکانیان کردەوە.. چاویان نوقاند و لەرزین. لەناخی خۆیاندا، ناخی تاریك و پڕ لە کینەو شەهوەت، ئێستا مرۆڤ دەکەورێ.. باڵندە لەفاق نزیك دەبێتەوە. ئەگەر ڕاسپاردەی مەسیح ئەوە بوو کە نابێ ئیشتیهای ژنی پیاوی دیکە بکەین. لەلایەن ئەمە جێ بەجێنەکرا، ئێستا سزای تاوانی گەورەی بەسەردا جێ بەجێ دەکرێ. تاوانی مەرگهێن. دەبێ " دان پیانان" بکاو بڵێ چەند گوناه لە سنگیدا شەپۆل دەدا.

بەلام پەنجەم کە خستمە چاومەوە بۆ ئەوەی بیرە شەڕانگێزەکان بخنکێم، هەمان پەنجە درێژدەکەم بۆ چاوی ئەوانیش، چاوەکانیان دەسمم بۆ ئەوەی پێیان بڵێم بەدەنگی وەك دەنگی کەوتنی بەردێك بۆ ناو دۆڵێکی قووڵی پڕ لە ئاوی مەنگ.

ئایا دەکرێ مرۆڤ بیر لە کوشتنی پەپوولەیەکی ڕەش و زەرد بکاتەوە، پەپوولەیەکی جوان و خەمبار؟ لەوانەیە باوکە پیرۆزەکان ئەوە بکەن... دەیانەوێ کاتە بەتاڵ و بێ ئیشەکەی خۆیان بە کوشتنی مەخلوقە بچووکەکانی خوا پڕ بکەنەوە بۆ ساتێکیش بیرم لەوە نەکردەوە. ئەم ژنە پەپوولە نییە، باڵندەیەکی باڵ نەخشین نییە. سروود نییە، چڵێ نەبوو لە دژی زەیزەفونی پاکژ و بێگەرد.. لەمانە زیاتر بوو. ئێوەش ئەی باوکان شەرتان لەمن لادەن. ئێوە ئەی ئەوانی دیکە بۆتان هەیە بڵێن

گەمژەیــە، هــەرزەکاری بــەس نییــە، بــێ بــەش وەك بیرێکــی وشــك وایــە، ئــەوەی ئێســتا گوێتان لێیە لە گەمژەییەوە نزیکە.

لەسی ساڵیدا... تۆزێ زیـاتر.. تـۆزێ کـەمتر.. گـرنگ نییـە.. لـەو چیا بـەرزەی پـڕە لە سەوزایی و رادمیلا، ئـافرەتی ئیشـتیها کـراو و ئافرەتـانی دیکـەش، بـەڵام بـە گـوێرەی مــن تــەنها ئــەم ژنــە هەیــە، کــە ئێســتا کۆمــەڵێ دەوری داوە و لــە دوایــەوە ودەڕۆن وەك (خزمــەتکار — حاشــیە) مێردەکــەش بــە کراســە ڕەنگاوڕەنگەکەیــەوە و بــەبێ دەنگــی و تەندروستییە باشەکەیەوە.

من هەڵم نەبژارد، هیچ نـەخش و پلانـێکم نـەبوو، شـتەکە بـێ ئـەوەی ئاگـام لـە خـۆم بێ روویدا و بوو بە تاڤگەیەکی لەرزوتاو گەمارۆ.

ئایــا ســەری دانەوانــد بــۆ ســڵاوکردن؟ ئایــا وەهمێکــە و خــۆم دروســتم کــرد، شــتێك روویــدا لەســەر کورســییەکە گرمۆڵــە بــووم، دەمویســت بچــمە نــاوی، ئەگــەر ئازاباما یــە رامدەکرد، راوەستام وەك عەبدێك ڕێم بـۆ ئـەو (ملکـوت) ە پـیرۆزە چـۆڵ کـرد کـە لەسـەر دووپــێ دەڕوا. دەمارەکــانی لەشــم لــە ترســا خاوبوونــەوە، بمبــوورە ئەگــەر بڵــێم لیــك لــە دەممەوە دەرچــووبێ ئــەوەی بــەخۆم بــزانم. وەك تەقەیــەکی لــەناکاو لەســەر چــەناگەم هەســتم پێی کرد.. تەنها ئـەو بینیـی. زۆر شـەرمەزار بـووم تـا رادەی گریـان. دەسـتم بـەرزکردەوە بــۆ ئــەوەی لیکەکــەی دەمــم بســڕم. لــەو ســاتەدا ئاواتــەخوازبووم ببوومایــە بــە خــۆڕەی بایێك بۆ ئـەوەی رابکـەم و دیـار نـەمێنم. یـان ببومایـە بـە عـەمودێکی بـەردینی کـەڕ و لاڵ. ئــەو کرمــەی لــەناو خوێنمــدا بــوو، کەچــی پیــاوان و ژنــە خنکاوەکــان بــوو، کــە لــە نەبووپندا خنکابوون. ئەم کرمـە سـاڵەهای سـاڵ دەخـەوت و دەمـرد نـەدەما. پاشـان لـەپڕ دەتەقییەوە و دەبوو بـە بـایێکی تونـدو لـەدیوارەکانی سـنگی دەدا لـەناوەوە. ئـیتر ئەوسـا نەمدەتوانی بخـەوم. خـەو دەبـووە گیانـەوەری هـەزار چـڕنووکی و لـە گوشـتەکەم چـەقیوە و لەسەر ملم دانیشتووە، فشـارم دەخاتەسـەر، هەرکـە خەونـە قورسـە کۆتـایی هـات هەسـتم بە ترس کرد و گەڕامەوە ئەو دۆخەی پێی دەڵێن پەرۆشی.

کرمەکــە هــەرخۆی، ڕەشــەکە، تێکــەڵ بــە خــوێنم بــوو لــەو ئوتێلــە شــاخاوییەدا بەنائومێدی هەستم بە خنکان کـرد، مـن هـاتم ئیسـراحەت بکـەم (یـان تفاهـە) وەك مـیرا حەزدەکا وا بڵێ. لـەپڕ دوای ئـەوەی ئـەو چـاوانەم دیـت. نـەمتوانی بخـەوم. لەسـەر سـنگم

کۆمەڵــە گیانــەوەرێکی گــەورە چــۆکیان دادا. ددان تیــژو چــڕنووکەکەی لــە پــۆڵا بــوو. کــە ویستم رابکەم خۆم بینی کەوتمە داوی پەرۆشی.

نەمتوانی زۆر بمێنم لە ساتێکدا هەسـتم کـرد ئـەمرم. لـە سـاتێکی دیکـەدا لـە گریـان بــەدەنگی بــەرز ترســام. خــۆمم وەك تفێکــی چــەور هاتــە پــێش چــاو، کــە خــەریك بــوو دەخنکــام. ئــەوەی لەســەر کورســییە ســپییەکە دانیشــت و قاچــی درێــژکردبوو بــۆ سووچــێکی شــوراکە، ئــەوە نــاکرێ هــەر بەتــەنها ژن بــێ، خــاوەن دووچــاوی خــەمۆکی و دڵێکی زومروتی یـە. ئـەوەی لـە پێشـەخۆمی دەبیـنم بریتییـە لـە گەنجینەیـەك لـە سـۆز، کــە هــیچ باڵندەیــەك خــەونی پێوەنــابینێ. ئــەزانی تەماشــای ئــەویان نەئــەکرد، بــەڵکو سەرقاڵی گەلایەك بوون، کە بــوونی بــێ نرخــی لێــوە دەهــات، بیریــان لــەو وشــە ناپەســەندە دەکــردەوە کــە لــە هــەموو یادەوەرییەکــدا پاشەکشــە دەکــا تــاکو لــە یــادی ئــەو کەســەی دایهێنــا وەك ســواڵکەرێکی بێــزار رادە وەســتێ. واز لــە وشــە یــەکتربڕەکان بهێــنن و گــوێ لە هەناســە ناســکەکانی بگــرن، کــە لــە ســنگیدا وەك شــەپۆلی بچــووکی یــاقووت دەجمــا. تەماشای دووچاوی بکـەن، کـە هـیچ مرۆیـەك خـەونی پێـوە نـەدیبوو. خـوا خـۆی کـە لـە قــوڕ ئــەو دوو چــاوەی دروســت کــرد تــاڕادەی راچــڵەکین لای جــوان بــوو، بــەڵام هــەر ئــەم خوایە خۆی دەیـەوێ (لەسـاتێکدا) ئـەو دووچـاوە دابخـاو بیکاتـەوە بـە خـۆڵ. ئـەی خوایـە ئەمە چەند بێ مانایی و دڵڕەقی تێدایـە و چـەند ئـازار لـە دەروونـی مرۆڤـدا جـێ دەهێڵـێ و دەیگەیێنێتــە رادەی گریــان. لــە گــەڵاکان گــەڕێن، واز لــە هــەموو شــت بهێــنن، بەترسەوە بـە دەوری ئـەم عەرشـەدا بسـووڕێنەوە، بـەدەوری ئـەم ئـاگرە نەرمـە هەڵچـووە، کە ناکوژێتەوە تەنانەت ئەگەر خواش بیەوێ.

دانیشتبوون خـەریکی وشـە یـەکتربڕەکان بـوون، چـەند جـارێ پرسـیاریان لێکـرد بـەڵام وەڵامی نەدایەوە. تەماشای منی کرد و پێکەنی.

"رادمـیلا.. قـەت گـەردنت ئـازاد ناکـەم. ئەگـەر مـن لـە جێـی ئیڤـان بامایـە ئـەو شەوە هـەموو پەراسـووەکانتم دەشـکاند و قـژتم دەکـرد بـە کۆمـەڵێ خـوری و ئـەو بایـەی لە پەنجەرکەوە هاتـە ژوورێ یـاری پێـی بکـا. بـەڵام ئیڤـان کـە دەسـتی دەگرتـی ببـوو بـە نــوژدار و لــە پەتاکــە دەترســا. رادمــیلا ئــەی خــاوەن دوو لێــوە دەرپــەڕیوەکان ئەگــەر ئەمشــەو لەبەردەســتمدا بــوا بیــێ وامــدەکرد. رووبــاری عــەزاب کــە لــە نــاخی منــدا هەڵـدەقوڵێ ببـێ بـە فیشـەکی تـواوە تـۆ بتوێنێتـەوە و بتکـا بـە هـەڵمێکی شـینی پیـاو

کــوژ" دەمویســت شــتێ وردو خــاش بکــەم. رادمــیلا ئــەم بەیانییــە دوور رۆیشــت، دارســــنەوبەرە گەورەکـــەی بەجێهێشـــت و پـــاش ماوەیـــەك ســـەردەکەێ و دەس بەرزدەکاتــەوە وەك چــارۆکەییێکی بــڕاو لەســەرو گردەکــە، ئیڤــان پێشــی کــەوت ولــەوێ بوو،لەوانەیـــە چـــووبنە ئـــەودیو،ئیڤان دەیـــەوێ زۆر دوورکەوێتـــەوە، هەســـت بـــە تەماشــاکردنە بێزارەکــەی مــن دەکــا، هەســت بــە ئارەزووەکــەم دەکــا، کــە بــە دوای رادمــیلادا دەڕوا وەك بایــەکی زۆر گــەرم "دوورکــەوە ئیڤــان، چــیتر نــاتوانم تەماشــات بکــەم." دەبــێ یــەکێ پــێم بڵــێ مــرۆڤ چــۆن بیردەکاتــەوە، مــن دەمــەوێ لــەم گەشــتە تاریکــەدا بــەردەوام بم. بیرۆکــەی ئــارەزوو !! چــۆن پەیــدا دەبــێ؟ چــۆن گــەورە دەبــێ و لــە خوێنــدا دەگەوزێتــەوە پاشــان دەبــێ بــە هــاوارو فیغــان. بــەگوێرەی مــن هــەموو شــتێ بــە نــاڕوونی روویــدا، منــی بینــی لێــوی خــۆم گەســت و خوێنــاویم کــرد، پاشــان بینیمــی چەناگەم بە تووڕەییە و دەخــورێنم. لــە هــەمان شــوێن، کــە لێکەکــەمی پێــدا رژا (ببــوورن لەم گلاوییە)تەماشــامی کــرد وەك بلێــی لۆمــەم دەکــا، پاشــان کــە جگەرەکــەی کوژانــدەوە سەری لار کردەوە (ئەمــەم بــە چــاوی خــۆم بینــی)، وەك دایکێــك لــە چــاویدا تێڕامــانێکی زۆر دلڕەقانە رەنگی دایەوە، کــە هەنــدێ وشــەیان لێ عاســی بــوو، مێردەکــەی ئــاوڕی لــەو ژن و مێردە دایــەوە، کــە دانیشــتبوون بەیەکــەوە بــە شــانازییەکەوە کــە لــە خۆبــایی بــوون دەچوو گوتی :

- لیلیان چارەسەری دەکا.

بەلایــەکی دەم و چــاوی تەماشــای کــرد.. ئــەویش ناچــار لێــی نزیــك بــوەوەو ســەری شــۆڕکردە ســەرکاغەزەکان تــاکو چارەســەری بکــا. لــەو کاتــە رووخێنــەر و شــێتەدا.. رامکرد کەواتە ناویم زانی.

کــە بــەرەو دارســنەوبەرەکە ســەرکەوتم ناوەکــەیم دەوتــەوە، چــەندین جــار دووبــارەم کــردەوەو لێگــەڕام وشــەکانی لــە گــوێ و خوێنمــەوە بچــۆڕێ. بــە دەنگــی بــەرز دووبــارەم کــردەوە. پاشــان ناوەکــەیم لــەو دەنگانــەدا دەدۆزییــەوە کــە، لــە دەوروپشــتم بــوون، لــە دەنگی با بەرزدەبووەوە.

لــەدەنگی باڵنــدە بچــووکەکان (گــوێم لێ بــوو ســەربازێکی بچــووك دەیگوتــەوە) لای جۆگەلەکە باشتر گوێم لێ بوو.

جۆگەلەکە لـە هـەموو شـتێ روونـتر بـوو، بـێ وەسـتان دەیگـوت : لیلیـان.. لیلیـان.. لیلیـان.. ئەمـە وەهمـە.. خەیاڵـە خەونـە.. گـرنگ نییـە.. دەتـوانن ئـەو وشـە گەورانـە بڵێن کـە خـەڵکی بـەڕێز پێیـان شـەرمە بیڵـێن.. ڕێتـان دەدەم تـووڕە نـابم. چـی لـەبارەی من دەزانن.. ئەگـەر پیـاوی ئـازان بڵـێن.. هـەمان وشـە بـێ ماناکـان دووبـارە دەکەنـەوە. ئـەو وشـانە پیـاوە عاقڵـەکانتان مانایـان بـۆ دەدۆزنـەوە جگـە لـەو مانایایـەی مانـدوو و سەرخۆشـەکان دەیلێنـەوە. بـەڕێز و زەحمەتییـەوە لـە کتێبـە قورسـەکانیان دەری دێـنن. دەزانم ئەوەی دەیڵێن هاوتـای مێشـك نییـە، هـەروەها هاوتـای لاشـەی فیلێکـی مـردووش نییە.

رادمـیلا بـەردی تێگـرتم.. مـن لـە ژێـر دار " حـور" ەکـەدا و لـە نزیـك کانیاوەکـە خـەوتبووم. نەخـەوتبووم بـەڵکو چـاوم لێـك نـابوو و هـەوڵم دەدا وێنەکـەی بهێنمـەوە بەرچاوم. زۆر لە دار (حـور) ەکـە روونـتر دەمبینـی. وەك ئـاو وابـوو. رادمـیلا کـە بـەردی سێیەمی فڕێ دا زۆر لە لیلیـان روونـتر بـوو، کـە لـەو کاتـەدا زۆر دوور کـەوتبووەوە ئیڤـان لـە تەنیشـتم دانیشـت. نەیدەویسـت راسـتەوخۆ تەماشـام بکـا، دەیویسـت لـە تیشـکدانەوەی وێنەکـەم لـە چـاوی رادمـیلادا بمبینـێ. چـەند جـارێ دانیشـتنەکەی گـۆڕی چەند بەردێکی فـڕێ دایـە جۆگەلەکـەوە وەك بڵێـت یـەکێك (رجـم) بکـا. کـە جگەرەیـەکم دایـێ بـە تووڕەییـەوە وەربیگـرت پاشـان شـقاتەیەکی داگیرسـاند تـەنها بـۆ جگەرەکـەی خـۆی، "ئەمەیـە گشـت هۆیـەکانت ئیڤـان لـەو جەنگـەی دەیگێـڕی" تەماشـای رادمـیلا بکە، بـاش تەماشـای بکـە، تەماشـای چـاوی بکـە.. ئـەو حـەزی لـە هـەموو پیاوێکـە.. تۆش تەنها یەك کەسی یەکێکی تووڕە کە خەریکە لە ئێرەییدا خۆت دەکوژی!"

شـەڕناکەم، بڕیـارم داوە شـەڕنەکەم، تەنانـەت ئەگـەر ئیڤـانیش ویسـتی شـەڕبکا. ئـەوەی مـن بـیری لێ دەکەمـەوە لـە هـەموو شـەڕەکان گـەورەترە، توندوتیـژترە، ئـازاری زیاترە. "بڕۆ ئیڤان، بەتەنیا جـێم بێڵـە... دەمـەوێ بـەدەنگی بـەرز نـاوی لیلیـان دووبـارە بکەمـەوە. دەمـەوێ لـە سـاتە هـەرە وروژێنـەرەکان و جوانـەکانی بـڕوانم و بیهێنمـە بەرچاوم.

ئیڤـان ئێسـتا و هـەموو کـاتێ عـەزابی خـۆت هەیـە... منـیش ئـەی مـن مـرۆڤ نـیم ئیڤان. ئایـا دەتـەوێ وەك ئـەوانی دیکـە بـی بـە چـاوی گلـەیی ڕووبەڕووبوونـەوە تەماشـام بکەی؟

لـێم گـەڕێ هیچـم لێـت نـاوێ، تـۆش ئـەی رادمـیلا.. ئایـا بەیەکـەوە خـەوتین؟ ئایـا جـارێ لـە جـاران تـۆم ناسـی؟ زۆر هەڵـە دەکـەی ئەگـەر وای بـۆ بچـێ. ئارەزووەکـانیش، شار تابووتێکی گەورەیە جێی هەموو شتی تێدا دەبێتەوە.

بۆنانی نیـوەڕۆ درەنـگ گەڕامـەوە، هۆڵەکـە چـۆڵ بـوو، خزمـەتکارەکانیش شـتەکانیان کۆدەکردەوە، بە بێزارییەوە تەماشـایان کـردم. بـۆ ئـەوەی کـەس بێـزار نەکـەم گـوتم تـەنها پـەرداخێ کۆنیـاکم دەوێ و لــە باڵکۆنەکــەش دادەنیشــم. ئاهێکیــان بەبــەردا هاتــەوە، کوڕە بچووکەکە کـە هـەموو شـەوێ دەبـێ بـە سـەماکەرێکی شـارەزاو سـەرنجی هـەموان رادەکێشێ. کاتێ کووپەکەی بۆ دانام لەگەڵ پەرداخی سۆدە، پێی گوتم:

نانی ئێوارە ئیمشەو لە سەعات حەوت پێشکەش دەکرێ!

زەردەخەندیەکی بۆ کرد وەك دڵدانەوەیەك بۆنانی نیوەڕۆی لەدەست چووم.

ئێـوارە هـەموو شـتێ گـۆڕا. ژنـان جـوانترین جلیـان لەبـەر کردبـوو. لاوانـی گوندەکـە هاتنـە ئۆتێلەکـە و تێکـەڵ بـەو خەڵکـە بـوون، لـە پیـاوان قـاتێ رەشـیان لەبـەردابوو لـە تەمـەنی خۆیـان بچـووکتر دیـاربوون. رادمـیلا و ئیڤـان زۆر درەنـگ پەیـدابوون و دیـاربوو ماندووبوون.

دوان، خــەمبار و رەنــگ زەرد.. لیلیــان و مــن. ســەمای نــەکرد. زۆریــان داوا لێکــرد بەڵام ئەو هیچـی قبـووڵ نـەکرد، مێردەکەشـی هـەموو کـاتێ کـە لەگـەڵ ئـەو سـپیکەلانە باڵابــەرزە ســەمای دەکــرد زۆر دڵخــۆش بــوو.. دووردەکەوتــەوەو دەچــووە ئەوســەری هۆڵەکـە. لـەوێ چـاوم لێ بـوو پێکـەنینێکی بچـووك دەم و چـاوی دەنەخشـاند، هـەروەها دەسـتی چـەپی ئەویشـم دەدی کەتونـد لـەناو قـەدی قـایمی دەکـرد، قـەت بـۆ سـاتێکیش پەشـیمانی پێـوە دیارنـەبوو. کـە مانـدووبوو هەریەکـە لـە جێیەکـەی خـۆی دانیشـت. دیــاربوو ناڕەحــەت و بێــدەنگ بــوو، چــاوی بڕیبــووە ســەماکەرەکان و تەماشــای "القدیسە"شی نەدەکرد.

زۆر هەڵــە دەکــەن ئــەی باوکــە پیرۆزەکــان ئەگــەر واتێبگــەن کــە تــەنها جێگــای بـەختیاری لـە ئاسمانداـیـە. لەسـەر ئـەم زەوییـە شـتێ هەیـە، نـاڵێم لـە خۆشـی زیـاترە، ئەوەی مرۆڤیش پێویسـتی پێـی هەیـە خۆشـییە، ئەگـەر لـەوە زیـاتری داواکـرد دەکەوێتـە داوی گەڕاین بەدوای شتێکدا،کە نییە.

لـەو سـێ سـەعاتەی لـە هۆلەکـە دانیشـتین، هەسـتم بـە خۆشـییەکی راسـتەقینەکرد، خۆشـییەکی بـۆ مـرۆڤ نارەخسـێ مەگـەر بـە دەگمـەن.. چـاوەکانی وەك پەنجـەرەی روونـاك بـوون جگـەرە لـە نێـوان پەنجەکانیـدا دۆعایـە بـۆ هێـزێ، کـە گـەمارۆی لێ هـەڵگرێ. ئیشتیهاییێکی راستەقینەو بەپیتی ژیان.

پەرداخــە شــەرابەکەش کــە نــەگۆڕا، لــە یادەوەریــدا وەك مێژوویــەکی راســتەقینەو تــەنها بــۆ ئــەوەی پێــی دەڵــێن هــۆگریی نێــوان دوو کــەس. ئاواتــەخوازبووم ئــەو پەرداخــە بامایە، لە نزیکەوە تەماشـام دەکـرد وەك پاڕانەوەیـەی کـێ کـە لـە سـەرەمەرگدا بـێ، بـە ئومێدی ئەوانەی تۆبـەیان کـردووە دوای حوکمـدان، دەمویسـت پێـی بڵـێم:" دەسـتت ئـەی نهێنیــی پــیرۆز، دەســتت کــە لــە پەرداخەکــە دەئــاڵێ لــە دەوری ملــی مــن دەئــاڵێ وەك تــاڵێکی ئاوریشــمی لێوەکانــت کــە لێوارەکــانی پەرداخەکــە مــاچ ئەکــەم وەك دەس لــە ملکردنی دایکانە بۆ کوڕەکانیان کاتێ دەچن بۆ جەنگێکی دوور.

هەناسەکانت کە بـە نـەرمی لەکانـدا بەسـەر هـەموو شـتێکدا شـۆڕدەبێتەوە سـەرەتا و کۆتایی ژیانە بە گـوێرەی مـن. ئـای لـەو ئـازارەی دڵ ئەگـەر شـتە نـەرم و هەسـتەوەرەکان بوون بە وشـەی مـردوو و لـە قورگـدا وەك ئێسـقانی ماسـی گیریـان خـوارد. گـرنگ نییـە بە لامەوە چی دەڵـێن، مـن ئیشـتیهام دەکـرد و دەسـووتام، چـەند جـار چـاومان بەرچـاوی یـەکتر کـەوت؟ چـەند جـار لێـك جیابوونـەوە؟ نـازانم. بـیرم کـردەوە لـە تاریکیـدا ڕابکـەم بکەومــە نــاو دەریاچــەکە و بمــرم، وەك پیــاوێکی هــەرە بەختــەوەر لــەم دنیایــەدا، بــیرم کـردەوە لـەژێر دارسـنەوبەرەکەدا یـان لەتەنیشـت کانیاوەکـەوە بخـەوم. دەمویسـت گـۆرانی بڵێم. دەم و چـاوم لـە خـۆم هەڵسـوم، هەسـتم بـە ئـارەزوویێکی لەوەسـف نـەهاتوو دەکـرد بۆ گریان.

بەرگـەی چـی بگـرم؟ چـی ئـەڵێن بیڵـێن، لـەوەی دەسـتم کـەوت زیـاترم نەدەویسـت. خـۆمم لـە چـاوەکانیدا ناشـت، پەشـیمان بوومـەوە، دڵـم خـۆش بـوو، کۆچـم کـرد پاشـان گەڕامــەوە، چــاوەکانی و دڵــی وەك پارچــە حــەریرێك فێنــك بــوون، دڵــی رازی بــوو، بەگلەیی بـوو، بووژایـەوەو زیـاتر لـە جـارێ پێکـەنی، منـیش پـەرداخم بـەرزدەکردەوە بـۆ ئــەوەی بەیەکــەوە بخۆینــەوە، کــەمان خــواردەوە، بــەڵام مــن لــەوەی راهــاتبووم لەســەری زیاترم خواردەوە و هەستم دەکرد دڵم خۆشەو گەشاوەیە.

کە مۆسیقاکە هێوربووەوە کچە سپیکەلانەکە لەگەڵ دوو کوڕو سێ کچی دیکە هۆڵەکەیان بەجێ هێشت. مێردەکەی تووڕە دیاربوو و بێدەنگ دانیشتبوو. کە تەماشای هۆڵەکەی کرد ئاوڕی لە دەوری خۆی دایەوە و لەپڕ بە توندی کێشای بەسەر مێزەکەدا، وەك ئاماژەیەك بۆ کۆتایی هاتنی دانیشتنەکەو... ڕۆیشتن.

ئاواتەخوازبووم پێ بنێم بەهەمان ئەو شوێنانەدا کە ئەو پێی لێ دان. خەریك بوو وابکەم، کە هەڵسام بەڵام لەو کاتەدا رادمیلا و ئیڤان دەرکەوتن و هاتنەلام، زۆریان بێ تاقەت کردم. ئیڤان هەر خۆی مایەی ماندووکردن بوو، بەڵام ئەم نەگبەتە وەك پشیلەیەك وایە بێزارنابێ لە راکردن و ماندوونابێ.. دەستی گرتم و گوتی :

- ئەگەر نەهاتیتایە!

- رادمیلا بۆچی حەزدەکەی بێزارم بکەی، پێت خۆشە هەموو جاری (استفزاز)م بکەی؟

وەك منداڵ پێکەنی، توند دەستمیشی گرتبوو، وەك بیەوێ تاقیم بکاتەوە. گوتی:

- خەڵکی دێنە ئێرە بۆ ئەوەی کاتێکی خۆش بەسەربەرن، کەچی تۆ لە شارەوە بارێ خەمت لەگەڵ خۆت هێناوەو هاتوویت بەسەر خەڵکیدا دابەشی بکەیت. ئەو کەسانەی نایانەوێ خەمبار بن یان مرۆڤ خەمبار ببینن.

ئەوەندە خەمبار نەبووم بەو رادەیەی رادمیلا ئاماژەی پێ کرد، لەو کاتەدا لە خۆشیدا دەگەشامەوە، بەڵام شێوازی دەربڕینی خۆشییەکەم شێوازێکی سادەبوو تا ئەو رادەیەی خەریکە رادمیلا بە چەند وشەیەکی کەم بیکوژێنێتەوە.

تەماشای ئیڤانم کرد بەزەییم پێداهاتەوە، وەك پیرێکی ماندوو هاتە پێش چاوم. بیرم لە هەندێ پیلان کردەوە، کە ئیڤان کوشتییەکەی – **ضحیە**- بێ. بەڵام کە من بیرم لەم دەکردەوە، دووبارە گوێم لە مۆسیقای چۆلەکان بوو، ئەمشەو ئەمە دووەم جارە لێ دەدەن، یەکەمجار کە لێ یان دا وەك جۆگەلەیەکی بزێوی پڕ لە خۆشی هاتەبەرچاوم، کە گوێی لە مۆسیقاکە دەگرت. ئێستا و بۆ جاری دووەم هەوڵ دەدەم بزاڤە پرشنگدارەکانی بهێنمەوە بەرچاوی خۆم، سەری کە بەملاو ئەولادا دەهات ناوقەدی کە بەرەو مێزەکە دەچووە پێش و هەردوو دەستیشی پەرداخە شەرابەکەیان توند گرتبوو.. بەمجۆرە بوو.

ئیڤــان پــەرداخێکی بــۆ پڕکــردم، بــێ ئــەوەی هەســت بکــەم دەســتم جووڵانــد و پەرداخەکە کەوتــە خــوارەوە و شــەرابەکە رژایــە ســەر کراســەکەی رادمــیلا، کــە داچــڵەکی پاشان پێ کـەنی و پاشەکشـەی کـرد وەك پشـیلەیەکی تۆقیـو، هـیچ شـتێ نـەدەکرا شـانی هەڵتەکانــد و کراســەکەی بــەرزکردەوە، قاچــەکانی بــە دەرکــەوتن، هەردووقاچــی وەك شــەراب سـپی و روون بـوون، ویسـتم دەس درێــژ بکــەم، بـۆ ماوەیــەکی زۆر تەماشـام کـرد و هەستم بە ئێرەیی دەکرد، کە ئیڤان تێکدەشکێنێ و ئازاری دە دا.

لێــرەدا هــەر قەشــەیەکی کــورت هــی هــەر (راعــی) کەنیســەیەك، تەنانــەت ئەگــەر کەنیسەیەکی گونـد بـێ و لـە شـوێنێکی لاچـەپ بـێ، بـۆی هەیـە کتێبـە پیرۆزەکـەی بـێ ترس بکاتەوە و هــەموو (وصــایا)کانم بەســەردا جـێ بـەجێ بکـا، چـڵکن و تامــەزرۆبووم و دەمویست جەنگی ئیڤان بکـەم، ئـەو دەعەوەتـە لـە چـاوی رادمـیلا دا ئاشـکراو دیـاربوو، هەسـتم بەلــەزەتێك کـرد، کـە نزیـك بـوو لـە ئیشـتیهاوە بـۆ لێـوە شـۆڕەکەی خـوارەوەی، پێشی خۆش بوو، کە بینیی من سەیری قاچەکانی دەکەم.

کــە مۆســیقای چــۆلەکان کۆتــایی هــات، مۆســیقییەکان دەســتیان کــرد بــە خواردنــەوە بۆ عاشـقەکان پاشـان ئامێرەکانیـان قـایم و ئامـادەکرد و دەسـتیان کـرد بـە گـەڕان بـەناو مێزەکانــدا و مۆســیقا لێــدان، ئــەو کاتــە هــەلی رەخســاوی مــن بــوو تــاکو بکشــێمەوە. گوتم بە ئیڤان، دەمویست بە وشەی رەق دڵی بدەمەوە.

- دەبــێ ئــاوازی (هــەموو شــەوێ.. بــۆ تــۆ دڵدارەکــەم) لێبــدەن. رادمــیلا هــاربوو لە جلەکانیــدا نــەرمی ئــافرەت و ورووژانــی رەنگیــان دەدایــەوە، کــە بــاڵمی دەگوشــی پێــی گوتم:

- دەبــێ ئیمشــەو لەگــەڵ ئێمــە بەســەربەری. بــا گوێمــان لــەو ئــاوازەبێ پێکــەوە، منیش هەموو شەوێ هی ئیڤانم.

چــاوەکانی دەخزانــە ژێــر پێســتەکەم، هەســتم پــێ کــرد تونــدو بــەرز بــوو و تەماشــای ئیڤانیشی نەکرد تا دانیشتنەکەی گۆڕی وەك بەڵگەیەك بۆ ناڕەزایی.

کە مۆسیقاژەنە دۆمەکــە نزیــك دەبــووەوە تەماشـای کـردو چـاوێکی لێـی داگـرت، کــە تەماشای رادمیلای کرد پێکەنی. هەندێ پارەم نایە مشتی و چپاندم بە گوێیدا.

- ئاوازی "برادەر دەگۆڕم وەك چۆن دار گەڵا خۆی دەگۆڕێ " لێبدە.

پـێش ئـەوەی مۆسـیقاکە دەس پـێ بکـا وەك پشـیلە خـۆم دزییـەوەو ڕامکـرد، لای دەرگاکە، کـە ئیڤـان دڵنیـابوو لـە ئاوازەکـە تەماشـای رادمـیلای کـرد و قسـەکانی تونـد هاتنـە پـێش چـاوم، بـەلام لـەو کاتـەدا دوورکەوتبوومـەوە، بۆیـە هیچـم نەبیسـت، وام هەسـت کـرد دەسـتی رادمیلاکـە بـەرزی دەکاتـەوە وەك هەڕەشـە وایـە نـەك خواحـافیزی. چـوومە باڵکۆنەکـە، تەماشـای پەنجـەرەکانی ئۆتێلەکـەم کـرد و بـەدوای سـێبەری لیلیانـدا دەگەڕام، لە خـۆمم پرسـی : لـە کـام ژوور دەخـەوێ؟ خـۆم وەڵامـی خـۆمم دایـەوە، چـوار پاشــان پەشــیمان بوومــەوە و گــوتم دوازدە، نــەء، حــەوت، نــە دوا ژوور لــە نهــۆمی سێیەم.. بەڵێ دوا ژوور.

هـەوڵم دا بهێنمـە پـێش چـاوم: لیلیـان لـە تاریکیـدا، لیلیـان خـەوتووە، لیلیـان لـە قەرەوێڵـەی لای راسـت و لەسـەر دەم و چـاوی دەخـەوت... نـا پێکـەوە خـەوتوون. نـا... ناکرێ لێگەڕێ لێی نزیك بێتەوە..

نەمتوانی چیتر بیربکەمەوە.

تـاریکی پاڵەپەسـتۆ دەخاتـە سـەر هەسـتەکانی مـرۆڤ و هـەموو شـتی نـاروون دەکـا.. تاریکایی باوکێکی گەورەیـە بـەزەیی بەخەمبارانـدا دێتـەوە.. دەسـت درێـژ دەکـا بـۆ ئـەو سـەرانە و دەسـتیان پیـا دێنـێ، مانـدوێتی و خـەمیان لێ دەسـڕێتەوە.. و نهێنییـەکان دەشـارێتەوە.. نهێنییـە بچـووکەکان تـەنها هـی دووکەسـە، نـەموێرا بـیر لـە عاشـقە بچـووکەکان و کۆتاییـەکانیان بکەمـەوە.. مـن بچـووك نـەبووم. بـەڵام نـەمتوانی لـەم دڵڕەقییـە کێویـە بگـەم، کـە لەسـەر زەوی بڵاوبووەتـەوە. وەك سـێبەرێکی تـەنك هـەموو شتێ دەکا بە هەڵە.

لیلیان لـە تاریکیـدا چـاوی دەکاتـەوە. ئایـا بـیر لـە مـن دەکاتـەوە؟ ئایـا شـێوازم بـە بەردەمیدا تێپـەڕی؟ رەنگـە بـیری لـەوە کردبێـتەوە بەیەکـەوە بـین، هێنامـە پـێش چـاوی خـۆم، کـە لەگـەڵ ژنـە سـپییەکەدا سـەما دەکـا، وەك بڵێیـت دەیـەوێ لەگەڵێـدا بخـەوێ، ئەگەر نا بۆ وا خەمبار دیار بـوو، کـە رۆیشـت.. ئـەی مـن.. چیم لـە لیلیـان دەوێ؟ ئایـا بیر لە رادمیلاو لیلیان بەیەکەوە دەکەمەوە ؟ ئایا لیلیان وەك ژنانی دیکە وایە؟

پێم گوت کـە زۆرتـرین شـت ئـازارم ئـەدا ئـەو گەشـتە تاریکەیـە کـە تیایـدا ون دەبم، لە کاتێکدا بیردەکەمەوە. دەمەوێ بزانم چـۆن بیرۆکـە لـە دایـك دەبـێ. چـۆن گـەورە دەبـێ

تــا دەبــێ بەهەوەســەییێکی شــێت، نەدەوەســتێ و نــە کۆتــایی دێــت. مــن تــەنها لیلیــانم دەوێ.

بەڵام چیم لێ دەوێ؟ دەستی بــە.. ئەگــەر بیخاتــە ســەر ناوچــەوانم ئەوســا لــە هــەموو مرۆڤایــەتی دڵخۆشــتر دەبم. دەجریــوێنم وەك گیانــەوەرێ هــەزاران ســاڵ بەنــدکرابێ، پاشــان توانیی دیــواری بەندەکــە بشــکێنێ و رزگــاری ببــێ، ئەگــەر بــە ســەرما نوشــتایەوە و قــژی خســتە ســەر دەم و چــاوم، ئەوســا دەگــریم و هــەموو و دنیــا بــە فرمێســکی خۆشــی پــڕ دەکەم. ئەگەر ناوچەوانی بەر سنگم کــەوت ئەوســا ئــاوات ئــەخوازم هــەر لــەو ســاتەدا بمــرم و چیدیکەم نەدەویست.

ئەگەر پێتان بڵــێم ژیــانی مــرۆڤ وەك هێڵــەکانی شــەمەندەفەر وایــە، ئایــا تێدەگــەی لــە مەبەســتم چییە؟ ئێمــە لەســەرەتاوە زمــانی هاوبــەشمان لــە نێوانــدا بــوو، ئێــوە ئــارەزووی ئەوەش ناکەن، کە لێم تــێ بگــەن. گــرنگ نییــە بەلامــەوە گەشــتەکەمم بــە تــەنها دەســت پێکــردو بەتــەنهاش کۆتــایی پــێ دێــنم. مــل بەســت، جزدانــی رەشــی چــەرم، زەردەخەنــە بــەرێکی نەخشــە بــۆ کێشــراوەکان، پاشــان بــۆنی عــەتر، ئایــا هیچــتان مــاوە بــەرێزان؟ من.. هیچم لــە ئێــوە نــاوێ، ئــەو خۆشــییەم بەســە کــە ئەوشــەو لــە خوێنمــدا کلّپــەی دا، چاوەکانیشـــــی وەك دوو گـــــوڵ و زەردەخەنەکەشـــــی وەك دەریایـــــەك بـــــەدەوری زەویـــــدا بسوورێتەوە.

ئایــا دوای ئــەو شــەوە هەســتم بــە پەشــیمانی کــرد؟ لــەوە زیــاترم ویســت؟ لــەرۆخی دەریاچــەکە تــەنیابووم، دەنگــی مۆســیقاکە زۆر کــز دەگەیشــتەلام، دارەکــان لــە تاریکیــدا نــوقم ببــوون و لەگــەڵ ئــەو ئــاوازەی بــا ســووکەڵەکە دەیهێنــا رێــك کــەوتبوون، بۆئــەوەی شـــەهوەتی یـــەکبوون لەگـــەڵ سروشـــت و گۆرانیـــدا لـــە خوێنـــدا بجـــوولێنن. پاشـــان دوا رووناکی دەبینم لە دەروازەی ئۆتێلەکە دەکوژێتەوە.. هەڵدەستم.

لـــە باڵکۆنەکـــە نزیـــك بوومـــەوە، چـــەند جـــارێ نـــاوی لیلیـــانم دووبـــارەکردەوە، وەك ئـــەوەی لەگـــەڵم بـــێ قســـەم لەگەڵـــدا کـــرد، تەماشـــای هۆڵەکـــەم کـــرد، بـــەڵام نەچـــوومە ژوورەوە تاکو ئیڤان و رادمیلا ببینم.

بەیانی کە لە خــەو هەڵســام پاســەکەم بینــی دەڕوا، لــە پێشــدا گــوێم لــە دەنگــی بــوو، کـــە لـــە پەنجەرەکـــەوە تەماشـــام کـــرد بـــەدەوری ئۆتێلەکـــەدا دەســـوڕایەوە بـــەرەو جـــادە سەرەکییەکە.

بەدرێـــژایی ئـــەو ڕۆژە نـــەمبینی. وەك گـــا نـــانم خـــوارد، خواردمـــەوە بـــۆ ئێـــوارەش نـــەهات، کـــەس دیارنەکـــەوت، لـــەوە دەچـــێ ئـــەو بەرنامەیـــەی ئۆتێلەکـــە بـــۆ هەنـــدێ لـــە میوانـــانی ئامـــادەکردبوو. ئەمیشـــی ڕاپێچـــابێ. پەشـــیمان بوومـــەوە، بـــەڵام هەســـتێکی هـــێمن وەك خۆبەدەســـتەوەدانبوو. پێویســـتم بـــە ئیســـراحەت هـــەبوو، ئـــەمڕۆ ئازایەتییـــەکی ئاژەڵیانە پـــاڵم پێـــوە دەنـــێ، شـــەق لەبـــەردەکانی ڕێگەکـــە بـــدەم. بەســـەر دار ســـنەوبەرەکەدا ســـەربکەوم، بـــەوێ وەك منـــداڵ وەســـیەتەکەی مـــیرا بگەیەنمـــە جـــێ، کـــە داوای لێدەکـــەم وەرزش بکەم، بەتایبەتی بازدان بە پانی.

ڕۆژی دوایـــی دیســـانەوە ڕۆیشـــتبوون، نـــازانم کـــەی، بـــەڵام کرێکـــاری ئۆتێلەکـــە پێـــی گوتم:

بەیانی سەعات پێنج دەبایە بڕوا گەورەم.

خـــەمم خـــوارد، ویســـتم شـــتێ بکـــەم، بـــەڵام هـــەموو شـــتێ بـــوو بـــە ڕابـــردوو و مـــن ڕابردووم خۆش دەوێ.. ئەمەم پێشتر بۆ باس کردوون."

بـــە ڕادمـــیلام گـــوت چاویشـــم بڕیبـــووە ئیڤـــان، بـــۆ ئـــەوەی ڕەزامەنـــدیی هـــەردووکیان وەربگرم.

گەشـــــتە ئەریســـــتۆکراتیەکە دەســـــتی پێکـــــرد و ئێمـــــەش وەك کۆمـــــەڵێکی بچـــــووك ماینەوە، چی دەبێ ئەگەر بچـین و بـەپێ پیاسـەیەك بکـەین ڕادمـیلا لـە خۆشـیا هەڵبـەزی هەر زۆر زوو ڕەزامەنـدیی دەربـڕی بـەڵام ئیڤـان بـەو عەقڵـەی کـە پـڕ بـوو لـە بـەغیلی و تـرس و دڵـەڕاوکێی پێـوە دیـاربوو پـێش ئـەوەی وەڵام بداتـەوە بـیری کـردەوە، بەرامبـەر و ڕۆژانـــی ڕادمـــیلا ویســـتی بەهانـــەی ئـــەوە بـــەکاربێنێ کـــە خواردمەنییـــە ڕادمـــیلا گـــوڵی دوای ماچی کرد وەك هۆیەك کاری تێ بکا.

- لـــە چێشـــتخانەکە خـــواردن دێـــنم. هەنـــدێ لـــە میوانـــەکانم بینـــی دوێنـــی خواردنەکانیان بردە ڕۆخی دەریاچەکە.

ئیڤـان سـەری ڕەزامەنـدیی لەقانـد. دوای یـەك سـەعات لوتکـەی گردەکـەمان بـەجێ هێشـتبوو. ڕادمـیلا سـوور بـوو لەسـەر ئـەوەی لـەوێ دانیشـتین، چـونکە خـۆی ڕاهـاتبوو لـەوێ دابنیشـێ. شـوێنەکە دەڕوانێتـە سـەر بـالکۆنی ئۆتێلەکـە و دەریاچـەکەش دوورە و لـە سـەوزاییەکی تێـردا مەلـە دەکـا. دەمویسـت خـۆم تـازە بکەمـەوە. ببمـە مرۆڤێـك پەیوەندیی بە خەمەوە نییە.

**دواشەو**

کـەس ئاگـای لێ نـەبوو کـە لەسـەر سـەکۆ دارینەکـە لەوپـەڕی هـۆڵی نانخواردنەکـە، وەسـتا، دووجـار بەدەسـتی چـەپڵەی لێـدا. هـەمووان لـەنان خـواردن وەسـتان و چـاویان بڕییە ئەو شوێنەی لێ وەستابوو. بەقـژە سـپییەکەوە لـە پەیکـەرێکی مـۆمی ئـەکرد، کـە زەردەخەندیەکی گەورەی هـەبوو، دەسـتی لێـك خشـاند و لێگـەڕا بـێ دەنگـی کاریگـەریی خـۆی هـەبێ. پاشـان لەبەرئـەوەی زۆر ئـەم زەردەخەنـەو وشـانەی دووبـارە کردبـووەوە لەسەرخۆ گوتی :

بـەناوی کارگێڕییـەوە بـەخێرهاتنتان دەکـەم، هیـوادارم ئـەم ماوەیـەی لێـرە بەسـەری دەبەن لەبیرتان نەچـێ، جـارێکی تـریش بێنـەوە. هـەروەها تکادەکـەم بـۆ برادەرەکانیشـتان باسی بکەن تاکو ئەوانیش بێن.

خوشـك و براکـان: ئـەمڕۆ دوا رۆژی مانەوەتانـە لێـرە. بۆیـە بەڕێوەبـەرێتی ئۆتێـل هەرچـەندە پێـی ناخۆشـە وا بەپەلـە بـڕۆن، بـەڵام وا "موفاجەئـە" گەورەکـەی خـۆی بـۆ ئەمشـەو رادەگـەیێنێ، بـۆ ئـەوەی ببێتـە بـەهێزترین یـادەوەری. ئێمـە ئاهـەنگێکی خۆشـاردنەوە — تنکریـە- دەکـەین، دەتـوانن بـۆ خۆتـان ماسـك یـان هەرشـتێکی دیکـە پێویستان پێیەتی لە کۆگاکەی بکڕن.

ئاهەنگەکـە لـە دە دەسـت پـێ دەکـا و لـە سـەعات شـەش کۆتـایی دێ، کـە کـاتی سەفەرتانە. سوپاس تا سەعات دە کە یەکتر دەبینین.

دەبـێ لیلیـان چ جـۆرە ماسـکێك لەبـەرکا ئەمشـەو ؟ ئایـا دەتـوانم بیناسمـەوە؟ ئایـا لێدەگەڕێ لەگەڵی دا سـەما بکـەم؟ ئەگـەر مـن هـاتم و ئـەو نـەهات؟ ئـەی مـن چ جـۆرە ماسکێك بۆ ئـەو خۆشـییە نەگبەتـەم باشـە، کـە سـبەینێ ڕادەکـا. دەمـەوێ دەم و چـاوی ئاسکێك بخەمە سەر دەم و چاوم، دووچاوی پڕ سکاڵا و دەم و چاوێکی زەردو ترساو.

ئـەی چـۆنە ئەگـەر دەم و چـاوی "نعامـە" م بـەکارهێنا. لیلیـان وەرە بـا چـاوەکانت ببینم، دەمەوێ تیایانـدا بخنکـێم "ماسـك" یـش تـەنها بریتییـە لـە پـەرژینێك لـە دڕك و داڵ، نـاتوانم جگـە لـە خـۆت وەك شـتی دیکـە بتبیـنم. قـژت مـاچ ئەکـەم، ئەگـەر قـژت بڵاوبـووەوە بەسـەر شـانما، ئـەوا دەمسـووتێنێ. ئەگـەر دەسـتە ناسـکەکەت دەسـتمی گرت، پاش ماوەیـەك نـامبینی، چـونکە وردو خـاش دەبم و دەتوێمـەوە، خـەمم بـۆ مـەخۆ

ئەگەر لەناو چووم، ئەگەر بووم بـه "غبـار" ێکـی تـەنك، کـە چـاو نـابینێ. بـەختیاردەبم، چونکە لەو ساتەدا بەدەورتا دەسوورێمەوە.. و تا هەتا هەتایە."

"باشـترین ماسـك کـە لـەبار بـێ بـۆ دەم و چـاوی مـن هـی پیاوێکـە، کـە بـە گاڵتەجاڕییـەوە پـێ بکـەنێ، دەمـەوێ وات لێ بکـەم دڵخـۆش بـێ ئەگـەر بـۆ سـەعاتیش بـێ. بـەیانی لەیـەك جیادەبینـەوە لیلیـان، چـتر نـاتبینم، ئەگـەر بشـتبینم ئەوەنـدە لـێم نزیـك نـابێ. بـەڵێنم دەدەیتـێ ئەگـەر دەموچـاوی پیـاوێکی گاڵتـەجاڕم لەبـەرکرد، کـە تەنها ددانە پێکەنیناوییەکـەی دیـاربێ، بـەڵێنم دەدەیتـێ پـێ بکـەنی، دەبـێ پـێ بکـەنی، ئەمجارە لەبەرمن پێ بکەنە.

ئـەو پێکەنینـە دەبێتـە چـرایەك ڕێگـا تاریکـەکانم ڕوونـاك دەکاتـەوە. ئـەو تاریکاییـە خەمۆکییـەی لـە دەروونمدایـە ڕوونـاك دەکاتـەوە. شـتێکم پـێ بڵـێ لیلیـان، تـەنها چـەند سـاتێکی خۆشـیم لێـت دەوێ، دوای ئـەوە ئەگـەر جیهـان کۆتـایی هـات، ئەگـەر مـن کۆتاییم هات، ئەگەر باوکە پیرۆزەکان هەرچییەك دەڵێن.. من پەشیمان نابم."

ئایـا لـە رادمـیلا بپرسـم چ جـۆرە ماسـکێك لەبـەردەکا تـاکو خـۆی لێ لادەم، تـاکو نەکەومە ناو دەریاچـەی شـێتییەوە؟ " رادمـیلا... ئـەوەی مـن لـەتۆم دەوێ ئەمشـەو لـێم دووربکەویتـەوە، ئیڤـان نـاهێڵێ نزیـك بکەومـەوە، مـن ئەمـە دەزانم، بـەڵام تـۆ دەزانـی چۆن خۆت دەرباز بکـەی، چـۆن لـەززەت لـە دەمارەکـان هەڵمـژی پاشـان لێگـەڕێی شـل و شێواو بـێ بەرادەیـەك کـە نـاتوانێ بـڕوا. بـەدەنگی بـەرز پێـت دەڵـێم: رادمـیلا ئەمشـەو ڕەحمـم پـێ بکـە، ئەمـەی داوای دەکـەم، چ نـاوێکی لێ دەنێـی بینـێ... زەلیلـی... تکا... یارمەتی.. ناو گرنگ نییە، من ئەوەم دەوێ و دەبێ تۆش بیکەیت!"

بـەڵام رادمـیلا تـەنها ژنـێ نـابێ. دەیـان ژن و ژنـانی گونـدیش ئەمشـەو لێـرە دەبـن. دەبـێ بـە وردی بـزانم لیلیـان چ جـۆرە ماسـکێك لەبـەردەکا، بۆچـی هەڵخەڵـەتاو و سـەر لێشـێواو بم، ئـەی ئەگـەر دوایـی ژنـێکم دۆزییـەوە لیلیـان نـەبوو؟ مێردەکـەی ؟ مـن پیاوێکم داوای "صدقە" دەکەم.

ئایـا گـەورەم کـەرەم دەکـا و ئـەو "صـدقە" یـەی دەمـەوێ بمـداتێ؟ ژنەکـەی؟ چ پیاوێـك لەسـەر ڕووی زەوی ،"صـدقە" ی وەك ئەمـە قبـووڵ دەکـا. بـەڵام ئـەو پیـاوێکی باش دیارە.. ئەو شەوە بێ ئـەوەی مـن قەناعـەتی پـێ بهێـنم لەگـەڵی دا سـەمای نـەکرد، دوورکەوتەوە و تا ڕۆیشـت بـا دەسـتی لـە سـپیکەلانەکە دابـوو. یـەك وشـەی پـێ نـاڵێم..

دەبێ لە سالۆنی ئۆتێلەکە دانیشم نزیك کۆگاکە و چاودێرییان بکەم، کە ماسك دەکڕن.. بەڵام ئەم ماسکە نەفرەتیانە نهێنی خۆیان ئاشکرا ناکەن، پێچڕاوەتەوە. لەیەك دەچێ کە لەسەر دەم و چاو، بە زەردەخەنە گاڵتەجاڕییەکەی بە خراپکاریەکەی بە ناڕوونییەکەی دەکشێ. مرۆڤ هیچ شتێ نازانێ. ئەگەر بچی لەبارەی ماسکەکان پرسیار بکەی: ئایا دەتوانم شتێ هەڵێنجێنم ؟ مرۆڤ لە شەوی وادا دەیەوێ خۆی بشارێتەوە و دیارنەمێنێ. سیفەتە مرۆڤایەتییەکان لەبیربچێ. هەموو یەکێ لە دەموچاوی خۆی و زەردەخەنە گەمژەییەکەی بێزار دەبێ.. لە تێڕوانینی هێمن و لەسەرخۆ بێزار دەبێ. زۆربەی ماسکەکان هی مەیمونن کە پێدەکەنن. هی باڵندەی بەدبەخت و کەرن، ئێوەکە ئەم ماسکانەتان دروستکرد بیرتان لەبەدبەختی نەکردەوە. بیرتان لەو عەزابە نەکردەوە، کە لە پشت زەردەخەنەکانەوەیە. بۆچی جوانترین ماسکتان بۆ جوانترین ئافرەت دروست نەکرد؟

ماسکی پیت و دڵگەرمی ئەی نازانن ئەو ماسکەی ئەمشەو لیلیان لەبەری دەکا دەبێتە گەواهی گۆڕی ژیانم و هەموو کاتێ لەبیرم دەبێ. ئێوە نازانن کەس نازانێ... ئێوە ئەو کەسانەی دەخوێننەوە قەت رادەی ئەو ئازارە نازانن، کە من هەستی پێدەکەم. وشەکانی خۆتان بلێنەوە وشەی گەلێ لەوە پیستر دەزانم، بەزیاد لە زمانێ دەیزانم، بەڵام ئێستا هەرچییەك بڵێی کەڵکی نییە.

زۆر بە توندی مشتومڕیان دەکرد یان شێوەیان بەو جۆرە هاتە پێش چاوم. زۆر تەماشام کرد، دەمویست ئاگام لە هەموو تەفسیلاتەکان بێ تاکو بە زۆر رایکێشم و وەك خوایەکی ئەغریقی سەمای لەگەڵدا بکەم. پێڵاوەکانی رەش بوون و ئەڵقەی کانزایی زەردی وەك بازنەی بەناویەکداچووی تێدابوو. کراسەکەی لە رەنگی بەهار بوو: سەوزێکی هێمن لەگەڵ هێڵی بچووك لە نێوان رەش و وەنەوەشەیی، ئیتر نازانم چیترم بەبیردابێتەوە. بە خۆمم گوت پێویستم نییە تەماشای بکەم، بۆنەکەی دەزانم لێدانی دڵی دەزانم، تەنانەت ئەگەر لەناو هەزاران کەسدا بزربووبێ بەبێ ماندووبوون دەیدۆزمەوە، بە رادمیلام گوت وەك هانی بدەم بۆ پیلانێکی بچووك.

- چ جۆرە ماسکێك لەبەردەکەی ئیمشەو رادمیلا؟

تەماشای کردم و زەردەخەنەیەك گرتی، وەك بڵێیت هەستی کردو پێش ئەوەی وەڵام بداتەوە. بەشێوازێکی گاڵتەئامێزانە گوتی:

- دەتناسمەوە تەنانەت ئەگەر ماسکی مەیمونیشت لەبەرکردبێ.
- ئیڤان بە جۆرێکی سارد وەك رووبەڕووبوونەوەیەك گوتی
-ئەگەر رادمیلات ناسییەوە یەك بوتڵ شەمپانیات بۆ دەکەمەوە.
- ئەی ئەگەر دۆڕایت؟

بەهەمان رووبەڕووبوونەوە لێیم پرسی و هانی رادمیلاشم دەدا تاکو بدۆڕێنێ. دیسان بە هەمان شێوازی ساردو رووبەڕووبوونەوە گوتی :

- هیچم لێت ناوێ.. من تەنیا کەسێکم کە بە درێژایی شەوەکە سەمای لەگەڵدا دەکەم.

منیش گوتم و هەستیشم بەسەرکەوتن کرد:

- ئەگەر لە جێ هاتە دەر، بێ گومان رادمیلا دەناسم.

- چووە سالۆنەکە . لە نزیك دیوارەکەوە دانیشتم . کۆگاکە کەوتبووە لای چەپم، لە جێگەکەی خۆمەوە دەمتوانی هەموو شتی ببینم، بێ ئەوەی سەرنجی کەس راکێشم، خەڵکێکی زۆر هاتن و ئەو نەهات. بۆ دواکەوت؟ ئایا تا ئێستا لەگەڵی دا قسەدەکا سەبارەت بەو ماسکەی هەڵیدەبژێرێ؟ ئایا بڕیاریان داوە لەم ئاهەنگەدا بەشداری نەکەن؟ ئەی بۆ دواکەوتن؟

کە هات و چاومان بەیەك کەوت زەردەخەنەیەکی بۆ کردم. زەردەخەنەی چاو بوو، کەس نەیدەدیت کەس نەیدەدیت مەگەر ئەوانە نەبێ کە لێی راهاتبوون و تیایدا سووتابوون. لێوی نەترازا کە زەردەخەنەکەی کرد، بەڵام ئەو دونیایە لە یەك ساتدا رووناك بووەوە، نەك هەر رووناك بووەوە،بەڵکو بە کڵپەی خۆشی و لەززەت سووتا. چاوی لێ لانەدام تاکو بووە هاوتەریبم. تەماشای پێشەوەی خۆی دەکرد، بەڵام شتێکی تێدا بوو دەیڕوانییە من. هەستم کرد خوێنم دەجوولێ، قوڵپ دەدا، بە ترس و لەززەتەوە. ئایا مرۆڤ دەتوانی لەمەزیاتر لەو تەماشاکردنە بخوازێ؟

مێردەکەی لای پاکەتفرۆشێ وەستا و پاکەتێ جگەرەی کڕی. بەخۆشییەکی منداڵانەوە جگەرەیەکی لە پاکەتە دەرهێنا و دەنگی لێ بەرزکردەوە.

- لیلیان... هیچت دەوێ بۆت بکڕم؟

پێش ئەوەی چاوەڕێی وەڵامەکەی بکا بەردەوام بوو، سەری جگەرەکەی قرتاندو تفی کردەوە، جگەرەکەی خستبووە دەمییەوە، بەڵام داینەگیرساندبوو، کە رۆیشتن

دەستی خستە سەرشانی! دەستە قورسەکەی لەسەرشانی بوو، ئێستا دەس لە گۆشت و خوێنی دەدا، ئای کە بەختیارە بەختیاریی لەمجۆرە مرۆڤ ناتوانێ بەرگەی بگرێ!

بریا لە زەویدا هێزێك هەبایە و ئەوەندەش زانا بوایە سێدارەی هەڵخستایە. من یەکەم کەسم دەمەوێ بخنکێنرێم.. ئەگەر دەستم خستە سەرشانی، ئەگەر ناو لەپم بەر خوێنەکەی، گۆشتەکەی کەوت، ئەوسا بە دەنگی بەرز وەك دەنگی هەورە تریشقە دەمگو :" تۆ ئەی ئەو کەسەی لای پێمەوە وەستاوی.. کورسییە نەگبەتەکەت هەڵبگرە و با بەپەلەش هەموو شتێ کۆتایی بێت!"

لەو سێ سەعاتەی کە دەکەوێتە نێوان نانی ئێوارە و کاتی ئاهەنگەکە من چیم کرد؟ بڕوابکەن ئەگەر بمەوێ لەبەردەم قەشەیەکی کاثولیکی دا بوەستم و بمەوێ دان بە تاوانمدا بنێم نەمدەتوانی یەك رستە بڵێم. سەیری چاوە بە تاڵە سەرسوڕماوەکەمی دەکردو دەلەرزی! هیچم نەکردووە. تەماشای بنمیچەکەم کرد، سەعات حەوت و نیو کە راکشام و تاپێش دە بە حەوت دەقیقە ئاگام لە خۆم بڕابوو.

کە تەماشای هۆڵەکەم کرد، دەنگی ئامێرو مرۆڤ بەرزبوو، تەپلەکانی دەگەشانەوە، ئامێرە مسینەکان ئەوەندە جوان بوون وەك بڵێیت بە بریقەدانەوەی گۆرانی دەڵێ. ئەی مرۆڤ.. ئاه چەند مرۆڤ ئازار دەچێژێ بۆ ئەوەی تێکچێ! ماسکی مەیمونە دەم بەپێکەنینەکان بەلێشاو، مەیمونەکان هۆڵەکە پڕ دەکەن، ماسکی ئاسکم بۆ نەدۆزرایەوە هەرچەندە بە درێژایی دوای نیوەڕۆ بۆی گەڕام. بۆیە ماسکێکی دیکەم کڕی. پیاوێ بەنیو سمێڵ و لەناوەڕاستەوە دەم و چاوی بەپانی کرابوو بە دووبەشەوە، بەشی سەرەوەی زەردو بەشی خوارەوەی لە رەنگی باینجان بوو. لە ناوەڕاستی رەنگە زەردەکەدا و نزیك چاو هەندێ هێڵ هەیە، وەك ئەوەی هیندییە سوورەکان دایدەنێن..

پێتان سەیرنەبێ ئەگەر لای خۆمەوە شتم بۆ ئەو ماسکە زیادکردبێ: بەشی خوارەوەم کون کرد و هەندێ پەتم پێوەکرد وەك ریش پەتی درێژو ئەستوور رەنگەکانیشیان جیاوازبوون بۆ وام کرد؟ کێ بیری بۆ ئەم یارییە بێ مانایە راکێشام؟ نازانم!

وەك سوارێکی دۆڕاو دەسووڕامەوە. تەماشای دەم و چاوەکانم کرد، لە نزیکەوە تەماشام کرد دەمویست بیاندۆزمەوە. رادمیلا قەت نائومێدی نەکردووم. هەر لە

سەرەتاوە ناسیمەوە، ملی بەرزکردبوو، رەنگە بە دوای مندا بگەڕێ ئیڤان لە تەنیشتییەوە ببوو بە قەشە. نەیدەویست لە دەستی دەربچێ، رەنگە منی ناسیبێ، کە منی بینی تەماشای دەکەم بە پەلە سووڕایەوە، کە سووڕاوە بە خۆمم گوت: نیوەی ڕێگەی بەهەشتت بڕی. ئەمشەو ناکەومە دەستی رادمیلا.

ئەی لیلیان دەبێ لە کوێ بێ؟ چیی لەبەردایە؟ زۆر گەڕام. لە نزیك پیاوێکەوە وەستام وامزانی مێردەکەیەتی، ماسکەکەی هی سوالکەرێك بوو کە لە دەمە گەورەکەیدا ددان نەبوو.. تەماشای دەوروپشتیم کرد و دەمویست دلدارەکەم بدۆزمەوە.. بەلام لەوێ نەبوو " ئەی تۆ لە کویت لیلیان ؟"

ناکرێ مرۆڤ هەست بە بێزاری بکا بەقەد ئەوەی بۆ دەرزییەك بگەڕێ لەناو کۆمەلە پووشێکدا، تەماشای دەم و چاوەکانم کرد.. تەماشای بنمیچەکەم کرد.. گەڕام.. ئاگام لێ نەبوو. کە موسیقا دەستی بە لێدان کرد!

خەلکی وا تێکەل بوون نووسان بەیەکەوە. هەنگاوی دوای ئەو ئەوە بوو، کە هەمووان ببن بە کۆمەلێ قاچی نییە، جۆرێك لەبەیەکداچوون، قورقوشمی تواوە کە زۆر نابا دەبێ بەیەك پارچە "سکبیە" جگە لەم وەستانە بێ مانایەی مۆسیقا هیچ شتێ بەشی ناکا، بەلام بۆماوەیەکی کەم و دیسانەوە لە جاران زیاتر بەیەکەوە دەنووسێن.

کە دەسووڕامەوە پێیان نابەپێما. چەند جارێ پالیان پێوە نام، چوومە پێشەوە، هاتمە دواوە، خەریك بوو بکەوم کە خۆم لەو زەبەلاحە لادا، کە ماسکی مندالێکی لە بەربوو!

کە چوومە ژوورەوە خەریك بوو بمرم. پێویستم بەکەس نەبوو بۆمی بدۆزێتەوە، کراسێکی رەشی درێژی لەبەردابوو تاقاچی دادەپۆشی، قۆلی رووت بوون، قژی کە کەوتبوونە سەر شان و ملی دەتگوت رەشەبایەکی بەفرینە.. دەموچاوی هەزاران جار لە مێردەکەی باشتری دەناسم.. لە خوا زیاتری دەناسم. دەموچاوی، چاوەکانی بوون، ماسکی ژنێکی گەورە لە دەمیا تەنها یەك ددان هەیە.. چرچ و لۆچی زۆربوون، هەروەها پارچە قژێ کە سەرەتای ناوچەوانیان پێکدەهێنا.

زۆر لای دەرگاکە وەستان، من دووربووم، تەماشام دەکرد، سەرەتا داچلەکی، ترسا، ویستی بگەڕێتەوە بەلام مێردەکەی باوەشی پێدا کردو نەیهێشت. خۆم دزییەوە تانزیکی کەوتمەوە. بەلام لەو کاتەدا دەستی بەسەماکرد، چاویشی بە هۆلەکەدا

دەگێڕا، دەگەڕا، رەنگە بەدوای مندا دەگەڕا، لەو ساتەدا لەگەڵ ژنێك دەستم بەسەماكرد كرد، چونكە زۆر دەوروخولی دەدام، خەریك بوو بكەوێ، چونكە من بەرەو لای لیلیان پالّم پێوەنا، كە لێی نزیك بوومەوە بە پەنجە بەچاو بەتاڵەكانی ریشەكەم پێم گوت... من لێرەم. لەو ساتە پڕ لە خەتەرو ترسە بەیەك گەیشتین، هەستم كرد لەشی دەلەرزێ كە منی ناسیەوە گەڕایەوە تاپشتی بەر شانم كەوت، خەریك بوو هاواربكەم، بتوێمەوە بەڵام ئەو ژنە كورتە توند منی گرتبوو، بۆیە ئێسقانەكانم قایم و توندبوون.

كەنیسە بەقەشەكانییەوە و تەنانەت بە (شماس) ەكانیشەوە، ئێستا تەماشای من دەكەن و چاودێری گەشتە گلاّوەكەم دەكەن. لەسەرخۆ، ئیسراحەت بكەن.. هەموو شتێكتان پێ دەڵێم، بەڵام تووڕە مەبن، ئەگەر لە دواییدا هیچتان نەدۆزییەوە.

بیرمە وەك ئازاری ئێسقانی وردو خاش بوو كە چاوم پێی كەوت مۆسیقا لێی دەدا. ئەی ئاسمانی وروژاو، ئەی هەورە تریشقە كە تەنانەت خۆڵیش دەسووتێنێ. ئەی لافاوە كوێرەكان بجووڵێ بباریَ و بسووتێنە و هەموو شانەیەكی لەشم بخنكێنە، چونكە ئەم لەشە دوای خۆشیی ئەو شەوە چیتری مەبەست نییە.

دەستم بەپەلە كێشایەوە و دەمویست لەو تەزووی كارەبایە رزگاری بكەم، كە هەموو لەشمی گرتەوە، بەڵام زۆرم لێوە نزیك بوو، دەستی نەرم و چاوەكانیشی تێ بڕیبووم و منی دەخنكاند! مرۆڤ دەبێ چ ترسێك لە ساتی مردنی لەسەرخۆ ترسناكترە؟ ویستم رابكەم، ویستم هاوار بكەم.. ئەی پەرۆشی تۆ خۆشەویستیت؟

چی دەڵێن بیڵێن (پێ بكەنن... مافی خۆتانە) نەبوونی.. هەرزەكاری.. خەون.. هیچ شتێكم مەبەست نییە مادام رێگەی (الجلجلە) م گرتەبەر.. ئێوەش ئەی قەشەكان دەبێ ببوورن، چونكە مەسیحییەكی مەجوسیم، هەموو چركەیەك هەزاران جار دەسووتێم. مردنی (المخلص- مەسیح) یەكجار بوو، بەڵام من هەزاران جار مردم، هەردەمرم. بڕۆن لێم دووركەونەوە.. ئەگەر نا...

پێویستە واز لە بیركردنەوە بێنم، كێ دەتوانێ ساتەكانی ترس و ئازایەتی و لەزەت و هەزاران هەستی دیكە بێنێتەوە بیر خۆی؟

كێ دەتوانی بهێنێتەوە بیر خۆی، بە هەمان گەورەیی كە لەبەرد بەهێزترەو لە موس تیژترە؟ كێ دەتوانێ بهێنێتەوە بیرخۆی بەو نەرمییەی كە لە ئاو دەچێ و لەناو

لەپەوە شۆڕ دەبێتەوە خوارەوە؟ من ناتوانم.. زۆرم هەوڵ دا بەڵام نەمتوانی ئایا ئێوە دەتوانن؟ نازانم هەوڵ بدەن. لەو شەوە نەگبەتییەدا بووم بە پیاوێکی نیمچە شێت.

ئایا بڕوا دەکەن کە ژمارەی ئەو وشانەی گوتمان لە (دە) تێپەڕی نەکرد؟ ئایا بیر لەوە دەکەنەوە دوو مرۆڤ ببن بە دوو منداڵ و بەیەکەوە و بێ ماندووبوون وشەی شێتانە بڵێنەوە؟

ئەو شەوە بۆ هەزاران جار ناویم دووبارە کردەوە، ئێستاش ئەگەر بمەوێ ئەو وشانە بێنمەوە بەریادم، کە گوزارە لەو ساتە پڕ کارەساتە دەکا چی بڵێم؟ هەستێ وەکو کەلەشێر خۆتان گیف بکەنەوە و شتێ بڵێن! (زمان زلیل و بێ دەسەڵاتە و لە هێشوە ترێیەکی وشك دەکات) وشەکانت بەسەر لێومەوە وەرز، بێ مانا، هەر لە زمانی سووکایەتی پێ کراوان دەچوو یان دەنگە ژەنگاوییەکان.

من نەمدەگوت (لیلیان) هەر بۆ ئەوەی ناوەکەی دووبارە بکەمەوە. من هەر پیتێکم دەکرد بەسروودێك، کە هیچ باڵندەیەك و هیچ کەشتیوانێ خەونیشی پێوە نەدیبوو. هیچ شاعیرێ نەیگوتبوو ( من ئێستا وشەی فێنك دەڵێم) پیتەکانی ناوەکەی لە مێشکمدا تیشکێکی خوێناوی بوو، کە هەزاران خەیاڵی وێرانکەری سەر عەرەبانەی هیوا نەهاتووەدی دەچۆڕا!

کە پێم گوت تۆم خۆش دەوێ لیلیان، هەستم کرد دەفرم. دەبم بە هەور، لە فەزایەکی شینی بریقەداردا مەلە دەکەم. بە پیرۆزی پێغەمبەرەکان پێم گوت:

- لیلیان دەمەوێ لەم ساتەدا بمرم.

ئایا فرمێسکەکانیم بینی کەوتنە خوارەوە؟ ئایا توند دەستمی گوشی؟ ئایا گۆنای لەملم نزیك کردەوە؟

ئەی مرۆڤی دڵ داڕزاو، خنکاو لە قوڕاوی ڕێکەوتی کوێردا، لە زمانی (الجنادب) کە توانای فڕینیان نەماوە.. تۆ هیچ شتێ نازانی..

گوڵێکی خەمبار لەسەر گۆڕێکی نەناسراو جێ بهێڵن.. بەجێ بێڵن بێ ئەوەی خەفەتی بۆ بخۆن.. بەڵکو ئازایانە.. ئەو شەوە من دڵی خۆم ڕەوانەی گۆڕستان کرد، لە گۆڕی مەجوسییەکەدا دڵی خۆمم ناشت.. تا ئێستاش ئەسووتێ و نایەوێ کۆتایی بێ..بەڵام ئێستا موڵکی نییە.

لیلیان قەت لەبیرت ناکەم، هەڵە دەکەم کەوا دەڵێم، بەڵام لێم گەڕێ با شتێکی مەجوسیانەت بۆ بڵێم: ئەو ئاگری لە دڵمدا ڕۆژێ لە ڕۆژان داگیرسا.. قەت ناکوژێتەوە.

* * *

لە سەعات شەش سێ پاس لای دەرگای سەرەکیی ئۆتێلەکە ڕاوەستابوو، قەدەریش هەر هەمان قەدەر بوو، واتە ئەو هێزە نەزانراوەی هەموو شتێ ڕێك دەخا، بەردەوامبوونی هەڵەکەشی ڕێکخست.

لیلیان سواری ترومبێلی یەکەم بوو، ڕەنگ زەرد خەمبار و زۆر نازدار، بەشەوقێکی کافر تەماشای دەکردم. دەیویست نارەزایی خۆی دەربڕێ لەسەر هەموو شتێ و دەس ڕاوەشاندنە بچووکەکەی، کە لە پەنجەرەکەوە دەری هێنا، کە ترومبێلەکە دوورکەوتەوە بانگەوازێکی خەمبار بوو بۆ باڵندەیەك کە بڕیاری دا زوو بمرێ.

* * *

**شار:**

چەپکە گوڵێکی سوور و میراش لەسەر شۆستەی وێستگەکەبوو، لە چاویا داوای لێ بووردنی دەکرد لە خەتایەك کردبێتی لە کاتی سەفەرەکەی مندا، من لە چاوی هەستم بەوە کرد، هەروەها لە دوورکەوتنەوەی گوڵەکەی خستە ناودەستم و باوەشی پێدا کردم، زۆر کەمتر فێنکی تێدابوو وەك لەوەی من بۆی دەچووم، لەسەرخۆ دوورم خستەوە و گوڵەکانم دایەوە دەستی. هەردوو دەستیم گرت، لای شانییەوە ، تەماشام کرد. میرامانای ئەم تەماشاکردنەی من دەزانێ. زەردەخەنەیەك گرتی، لێوی خوارەوەی بێ ئەوەی مەبەستی بێ لەرزی، تەماشای دەوروبەری خۆی کرد بە دوای شتێکدا دەگەڕا بەرگریی پێ لەخۆی بکا، تۆزێك جوولایەوە و لەدەست و لە چاوم دەرباز بوو، پاشان وەك دەستی بە هێرشەکەی کردبێ گوتی :

- زۆر گۆڕاوی... نەخۆش نیت؟
- ماندووم میرا.

لەوە دەچی ئەم وشەیەم پڕ نیگەرانییەوە گوتبێ، ئەگەر نا بۆچی بەو جۆرە تەماشای کردم، وەك بڵێیت لە چاومدا خەتایەکی گەورەتری لەخەتاکە خۆی بینیبێ، سەری لەقاند و پرسیاری لێ کردم.

- ڕەنگی زەردت بەڵگەی ماندووبوونت نییە. لەوە دەچێ نەخۆش بی... نەخۆش نیت؟

بە شێوازی سستەرە بە تەمەنەکان کە ئیش و کارەکانیان لە سنووری هەست کردن بە ئەرك جێ بەجێ دەکەن، دەستی خستە سەر ناوچەوانم، منیش پێکەنیم و لێم پرسی.

- لەکاتی سەفەری مندا چیت کرد؟

- دەبێ چی بکەم؟ ژیان هەمان شتە هەموو ڕۆژێ دەچووم بۆ ئیش. دووجار چوومە سینەما.. زۆرم خوێندەوە.

ماوەیەك وەستا پاشان بە شێوازی خۆبەدەستەوەدان گوتی :

- دوو شیعرم دانا. یەکێکیان بۆ تۆ و دووەمیش..

- پێش قسەکەی تەواو بکا گوتم.

- یەکێکیش بۆ ئەو.

- کێ؟

- بۆئەو.. تۆ دەزانی من مەبەستم کێیە.

تەماشای شوێنێکی دووری کردو گوتی :" نەیدەویست چاوەکانی ببینم.

- پێش ئەوەی پرسیارت لێ بکەم، پێش ئەوەی بزانم تۆ چیت کردووە هەوڵ دەدەی گەمارۆم دەی.

- تووڕەمەبە من ئەو دادپەروربیە دەزانم، کە تۆ لە هەڵسوکەوتدا پشتی پێ دەبەستی... جا کە شیعرێکت بۆ من هۆنیبێتەوە، دادپەروەری لەوەدایە ئەوی دیکە بۆ ئەو بێ.

- هەردووکیانت بۆ دەخوێنمەوە، ئیتر خۆت دەبینی!

- دووەم لەبارەی چییە؟

- لەبارەی دەریا.

- ئەگەر وابێ من هەڵەم نەکردووە، یەکێکیان بۆ شاخ و ئەوی دیکەیان بۆ دەریا.

- هەمیشە حەزت لە گاڵتەجارییە.

- زۆر بیرم دەکردی میرا. ئەو کاڵەکە نەفرەتییەکەش کە بە درێژایی ڕێگاکە هەڵم گرت پاشان لای دەرگای ئۆتێلەکە لە دەستم کەوتە خوارەوەو شکا. زۆر شڵەژاندمی.

- بێگومان لەگەڵ ژنان.

- لەگەڵ خۆم میرا، لای دەرگای ئۆتێلەکە شکا، دوای ئەوەی ماندووبووم بە هەڵگرتنی و لە کۆتایی ڕێ نزیك بوومەوە پێی باش بوو خۆی بکوژێ.

چووینە ژوورەکەم، میرا کە روناکییەکە لە سەرەوە لێی دەدا کەمتر مرۆڤی دەورووژاند، تەنانەت بیرۆکەی بەیەکەوە نووستن بەلامەوە شتێکی باش نەبوو، ئاواتەخوازبووم ئەم بیرۆکەیە بەهەر رێگەیەك بێ نەمێنێ.

بەڵام ئەم ژوورە نەفرەتییە، بەو قەرەوێڵەیەی لەسەرەوە دانراوە لە نزیك دیوارەکە، بەو رووناکییەی دەڕژێتە ناوی سەوزاییەکی تیشکدار پەخش دەکا، بەو سێ وێنەیەی یارییە ترسناکەکەی بینی، ئەم ژوورە پێشتر منی زۆر بینیبوو. لای سەری میراوە ڕادەوەستم. نزیك رووناکییەکە هەوڵ دەدەم ئەو گۆڤارە بخوێنمەوە، کە لەسەرمێزەکەی دایناوە. دەستم بۆی خشا بەرەو پشتی و سنگی و میراش قبوول ناکات، لەشیم لێ دووردەخاتەوە، پاشان من ملی دەگرم و ئەویش لێوەکانیم دەداتێ و وەك کۆترێکی بچووك هەڵیدەگرم بۆ سەر جێگەکە، بێ ئەوەی یەك وشە بڵێین ژوورەکە پڕ دەبێ لە جۆرێ لە بۆن، پاشان دەس دەکا بە هەناسە و هاواری بچووك و لە کۆتایی رادەکشێین. هەریەکەو لەلایەکی جێگەکەوە، دەستە ماندووەکانیشمان دوا پردی ئەو لەزەتە راکردووە.

ئەم ژوورە باش نییە. بەو درێژییەی کە لە پرد دەچێ، بەو زۆپا درێژەی بەرامبەر قەرەوێڵەکە دانراوە، بەدەرگا درێژەکە، کە لەو سەرەوە دەگاتەوە حەمامەکە.. تەنانەت فەرشەکەش پارچە قوماشێکی درێژی لەسەر دانراوە دەرگاکە بە قەرەوێڵەکە دەبەستێتەوە. ئەم گشتە لاکێشیانە لەپڕ هێمای لەشی ئافرەت دەدەنێ. لەگەڵ خەوتن.

یەکەمجار میرا شیعری دەریای بۆ خوێندمەوە بۆ ئەوەی بەرگری لە خۆی بکا.. شیعرێکی ئاسایی بوو هیچ گەرمییەکی تێدانەبوو، بەڵکو زیاتر لە وەسفی دەرەکی دەچوو، رامکێشا و پێم گوت.

- شیعرەکەم دەمەوێ بە رووتی بیخوێنمەوە!

رایکرد، هەمان شێوازی ورووژێنەر کە پەیڕەویی دەکا.

دەرگاکەی کردەوەو گوتی :

- ئەگەر یەك هەنگاو بجوولێی رادەکەم.

گەڕامەوە، با یارییەکە کۆتایی پێ بێنین، لەسەر لێواری قەرەوێڵەکە دانیشتم و دوگمەکانی کراسەکەم کردەوە. لەسەر خۆ دەرگای داخست و پشتی دا بە دیوارەکەوە، تەماشای بزاڤی لەسەرخۆ و نەخشە بۆ کێشراوی منی دەکرد.گوتی :

- بەڵێنت نەدامێ دوای ئەوەی دێیتەوە هیچ نەکەیت.
- ئایا دەمانەوێ شتی بکەین ئێستا ؟
- ئەی بۆ جلەکانت دائەکەنی؟
- هەست بە گەرما دەکەم میرا، پاشان جلەکان سەغڵەتم دەکا.
- ئایا بەڵێنی شەرەفم دەدەیتێ کە هیچ نەکەین؟
- ئەمجارە تاقیم بکەرەوە.. بێ بەڵێنی شەرەف!
- نا : دەمەوێ بەڵێنم بدەیتێ.
- وەرە بێ وشە و بۆ خۆت دڵنیابە!
- ئەی بۆ لە دەوری مێزەکە وەك خەڵکی عاقل دانەنیشین؟
- میرا: وەرە تاقەتم چوو!
- رادەکەم، تۆش دەمناسی.

گورج رام کرد و دەرگام داخست. ئەو خێرابییەی منی بەلاوە سەیر بوو، هەر بۆ ئەوەی بمورووژێنێ گوتی:

- پێش ماوەیەك ماندووبوویت.. نەخۆش بوویت!

شێوازی دەنگی خۆی گۆڕی. ئیتر هێمن و حەکیمانە دیاربوو کە گوتی

- هەموو پیاوان ئاوان. پێش ناو جێگا.. و دوای ئەویش!

- جیهانی پیاوان باش دەناسیت. کە پێشم گوتی شیعری دووەم بۆ ئەوە توورەبوویت! ئایا بە هەمان شێوە هەڵسوکەوتت لەگەڵ دەکا؟

ئەمجارەیان تووڕە بوو، یان وا دیاربوو. بەهەنگاوی بەهێز بەرەو مێزەکە چوو، لەسەرهەمان کورسی دانیشت. بڕیاری دا رووبەڕووم بوەستێ. زۆر ورووژێنتر دیاربوو، بە دەموچاوی توندو رامانە تیژەکانی وام هەست کرد رێم نادات و ئەو قسانەی کردم برینداری کردووە. لەسەر قەرەوێڵەکە راکشام و پێم گوت:

- رازیم ئێستا شیعرەکە بخوێنیتەوە بەلام چی تێدایە لە هەڵچوون ئەوسا بەرێوو شوێنێکی عەمەلی وەڵامی دەدەمەوە!

- دەستی کرد بە جگەرەکێشان بێ ئەوەی بایەخ بەو قسانە بدا، کە کردم گۆڤارێکم گرت بەدەستەوە کە لەسەرمێزە بچووکەکە بوو نزیك جێگەکە و بۆم فڕێ دا، ئەویش لەسەرخۆ لەسەر مێزەکەی دانا بێ ئەوەی جێی خۆی بگۆڕێ. لەناو جێگەکە جوولامەوە بۆ ئەوەی هەست بکا هەڵدەستم، بەلام نەجوولا، هاوارم کرد:

- میرا... ئەگەر نەیبێیت دەخەوم!

بێبایەخدان پێکەنی، لە مێشکیدا بیرۆکەی ئەوە گەلالە بوو کە بەجێم بێڵێ. من هەستم بەوەکرد لە شێوەی دەم و چاویەوە، کە زووبەزوو دەگۆڕا. وەك ئامادە بێ بۆ ئەوەی بڕیارێ بدا. لەپڕ تەماشام کرد خۆی کۆ دەکاتەوە. جانتاکەی هەڵگرت و بەرەو رووم هات وەك هەمیشە وایدەکرد. نوشتایەوە بەسەرماو ماچێکی بەپەلەی کردم پێش ئەوەی جێم بهێڵێ.

- لەبیرت نەچێ ئاو بە گوڵەکان بدەی.

بەرەو دەرگاکە رۆیشت کە بینی داخراوە، بەساردی و هێمنی گوتی:

- کلیلەکەم بدەرێ!

منیش بێ ئەوەی قسەبکەم کلیلەکەم دایێ. کە دەرگاکەی کردەوە و چووە دەرەوە پێش ئەوەی دەرگاکە دابخا گوتی:

- بەیانی پەیوەندیم پێوە بکە.. پێش دوو..!

زۆر تووڕەبووم کە گوێم لە هەنگاوەکانی بوو بە قالدرمەکاندا دەچێتە خوارەوە، کە دوورکەوتەوە پەشیمان بوومەوە. زۆر پەشیمان بووم، ویستم دوای بکەوم یان

دەرگـــای باڵکۆنەکـــە بکەمـــەوە و بـــانگی بکـــەم. بـــەڵام هەســـتەکانم دیارنـــەمایان، لـــە ڕاستیدا تێکچوو، بۆیە نەمدەزانی دەبێ چی بکەم.

ڕۆژی دوایـــی پەیوەنـــدیم نـــەکرد، ڕۆژی دواتـــریش هـــەروەها لـــە ســـێیەم ڕۆژدا پەیوەنـــدیم کـــرد. لەقســـەکانییەوە دیـــاربوو ســـاردو تـــووڕە بـــوو. داوای لێ بـــووردنی کـــرد، کـــە ئـــەمڕۆ ناتوانێ ببینێ، چونکە دەبێ کچێکی دۆستی ببینێ.

کەواتـــە مـــیرا دەســـتی پێکـــرد! دەیـــەوێ تۆڵەبکاتـــەوە. دەیـــەوێ دەرســـێکم دابـــدا، باوابێ! میرا تاقە ژن نییـــە لـــەم شـــارە گەورەیـــەدا لـــە شـــاردا هـــەزاران ژن هـــەن جـــا ئەگـــەر لـــە مـــاوەی ڕابـــوردوودا پەیوەندییـــەکم لەگەڵیـــدا هـــەبووبێ، چـــونکە بێزاربـــووم. دەمزانـــی پەیوەنـــدیی هەیـــە لەگـــەڵ یـــەکێك لـــە هـــەمان شـــوێنی کارکردنەکـــەیان. زۆر بـــە یەکـــەوەم دیون.. ویســـتم بـــە شـــێوەیەك بـــۆی بچـــم کـــە هـــیچ کێشـــەیەك دروســـت نـــەبێ.. بـــە خـــۆمم گوت: باوازی لێ بێنم، بەرگە نـــاگرم، بـــەڵام دەبـــێ پـــێش ئـــەوەی کۆتـــایی بـــە پەیوەندییەکـــە بێنم لەگەڵیدا زەلیلی بکەم.

کـــاتێکی درەنـــگ هەســـتەکانم هێوربوونـــەوە. چـــتر مەبەســـتم نـــەبوو بەرهەڵســـتی مـــیرا بکەم یان شەڕێکی لەگـــەڵ دروســـت بکـــەم. بـــە خـــۆمم گـــوت وەك بڵێیـــت بـــەرگری لـــە مـــیرا بکـــەم و پاکانـــە بـــۆ ڕەفتارەکـــانی بهێنمـــەوە : تـــۆ.. بـــاولا ناناســـی؟ بۆچـــی بـــۆ خـــۆت بـــۆ هەموو شتی پاساوت هەیە، کەچـــی بـــۆ ئـــەم هـــەموو شـــتێکی لێ قەدەغـــە دەکـــەیت. مـــیرا چـــییە؟ ژنێکـــی ســـپی.. دەمێکـــی شـــەهوانی و لەشـــێکی ورووژێنـــەری هەیـــە.. ئێـــوە پێویســـتتان بـــە یـــەکتری هەیـــە، بـــێ وشـــەی گـــەورە گـــەورە بـــێ پەیوەنـــدیی **کـاثولیکی** لەکۆتاییدا بێ ئەنجام.. بەجۆرە ڕازی دەبێت.. دەبێ هەرواش بێت!

دوای ئـــــەوەی مـــــیرا تەلەفۆنەکـــــەی داخســـــت، چـــــووم بـــــۆ لای بـــــاولا. بـــــاولا، جگەرەدەکێشـــێ، هـــەردوو قاچـــی دەخاتـــە سەرکورســـی، کـــە چـــوومە یانـــەی کـــۆلیج کـــە منـــی بینـــی هـــاواری کـــرد، بـــەرەو ڕووم ڕایکـــرد، بـــێ ئـــەوەی گـــوێ بداتـــە تەماشـــاکردنی ئەوانەی لەگەڵی بوون.. لـــە گۆشـــەیەکی دوور دانیشـــتین. پـــێش ئـــەوەی یانـــە بـــە جـــێ بـــێڵم ڕێکەوتین سەعات پێنج ببینم.

باولا ژنێکـــی عەمەلییـــە. حـــەزی زۆر بـــە ئـــاڵۆزی نییـــە، پێدەکـــەنێ جگـــەرە دەکێشـــێ. دەخواتـــەوە. لـــەناو جێگـــەش لـــەززەت لـــە مێشـــکی مرۆڤـــەوە دەردێنـــێ. هەنـــدێ کـــاتێ دیـــــاریکراو دەمویســـــت و وام دەزانـــــی هـــــیچ ژنـــــێ جێـــــی ناگرێتـــــەوە.. بـــــەڵام کـــــە

لێدەبووینەوە.. دەبوو بە ژنێکی دیکە، گۆرانی دەڵێ کە وشەکانی هەموو پیس، بە رووتی دەچێ بۆ حەمام، بێ ئەوەی هەست بە کەمترین هەستی ترس یا شەرمەزاری بکا، دەرگای حەمامەکە داناخا، رێ بۆ منیش خۆش دەکا تەماشای لەشی بکەم، کاتێ دەسووڕێتەوە یان ژێر باڵی و نێوان هەردوو لاقی دەشوا. هیچ شتێ نەیدەشڵەژاند، وەك منداڵ پێدەکەنی، بازئەدا، تاکو کراسەکەی ژێرەوەی خۆی وشك دەبێتەوە. یەکێ لە جلەکانی من لەبەر دەکا، دەگەڕێتەوە ناو جێگا بۆ ئەوەی خۆی فێنك بکاتەوە، بەو بزاقە بە پیتەو جوانە من دەورووژێنێ. وەرەچەرخێم لە دەستی رابکەم، خۆی دەدا بەسەرما،دەخرێتە ژێرمەوە، کە ژوورەکە پڕ دەبێ لە بۆنی جگەرە و کۆنیاك کە تێکەڵ یەکدی بوون، دەخەوتین یان لە راستیدا ئەو دەخەوت بە تەنها، منیش بیردەکەمەوە ( من زۆر بیردەکەمەوە و خەمبارم نازانم بۆ."

حەزم دەکرد تەماشای دەم و چاوی باولا بکەم لە کاتی خەودا، زۆربەی کات هەناسەی رێك و پێك ، دەم و چاوی نەرم و دڵنیا، دەمارەکانی ملی بە جۆرێکی نەرم و جوان دەردەکەون و ون دەبن. سنگی بەرزی وەك سەردەمێکی هەمیشەیی کۆتایی نەهاتوو، کە خەبەری دەبێتەوە دەکێشێ بە روومەتمدا یان گاز لە قۆڵم دەگرێ. وەك بڵێیت کە من بەمجۆرە تەماشای دەکەم خەیانەتی لێ دەکەم.

باولا ئاوهابوو بۆ من.

دوای ئەوەی میرا تووڕە بوو... من و باولا.. چوار رۆژ هەموو شەوێ یەکترمان دەبینی. لەو چوار رۆژەدا بووبووم بە گیانەوەرێکی ماندوو، نەمدەتوانی دەستم بەرزبکەمەوە بۆ سەرم. لەگەڵیدا زۆر خەوتم، خواردمانەوە و خواردمان، بەڵام لە کاتێکی بێ مانادا بەپاولام گوت بۆ ئەوەی بیورووژێنم:

- ئێمە بێ نرخین باولا، قوتابی نین، دەبێ ببین بە گیانەوەر و لە ئاخوڕدا داماننێن بۆ چاککردنی وەچە — تحسين النسل- تۆ پێشوازی لە پیاوان دەکەی منیش پێشوازی لە ژنان دەکەم!

- ئایا لێم بێزاربووی ؟ دەتەوێ بڕۆم!.

- مەبەستم ئەوە نییە باولا.. بەڵام دەبێ بگەڕێینەوە ژیانێکی سروشتی وەك ئەو خەڵکە!

- کەواتە دەبێ چی بکەین؟

- هەفتەی جارێ یەکتر ببینین... دووجار!

راوەستام تاکو بزانم کاریگەریی وشەکانم چۆن دەبن، کە بینیم لچ هەڵدەقورتێنێ گوتم:

- تۆ دەزانی کە خوێندن وام لێ دەکا هەموو کاتم بۆ خوێندن تەرخان بکەم... تاکو لە کاتی لەباردا تەواوی بکەم!

- من رێی خوێندنت لێ دەگرم!

- مەبەستم ئەوە نەبوو باولا... بەڵام دەبێ کاتی خۆمان رێك خەین، ئەوە دوایین جار بۆ باولا سەرم لێ بدا.. چیتر ژوورەکەمی نەدی، چەند جارێ بینیم، بەڵام لەیانە لە چاپخانە و زۆرینەی جاریش ئەو کێتێبانەی رادەوەشاند کە هەڵیانی گرتبوو. بە شێوازێکی گاڵتەجارِیانە پێم دەڵێ ئەگەر داوام لێ بکردایە ئەو شەوە بەیەکەوەین:

- وریابە من خوێندکارم و ناتوانم کاتی خۆم بە فێربوونەوەدەم پاشان خوێندنەکەت رێی ئەوەت نادا بیر لە ژنان و رابواردن بکەیتەوە!

کۆتایی بە قسەکانی نەدەهێنا. بەڵکو وەك مامۆستایەك دەرس بڵێتەوە دەیگوت:

- سبەی گەورە دەبی و خوێندن تەواودەکەی پاشان ژن دێنی و منداڵت دەبێ.. بەڵام ئێستا... نابێ کاتی خۆت لەگەڵ ژناندا بەفیڕۆبدەی. ئەگەر وابکەی خوێندن و ژن و منداڵت لە کیس دەچێ.

باولام باش دەناسی. بۆیە لە وشەکانی تووڕەنەبووم و زۆریشم لێ نەکرد، ئەگەر واشم بکردایە هەر نەدەگۆڕا. ئەم جۆرە ژنانە بەو شانازیانەی کە هەیانە دەگاتە رادەی عینادی و توندڕەوی، لەوە زیاتری لێ چاوەڕوان ناکرێ.

دوای ئەوە بەیناوبەین لە شوێنە گشتییەکاندا یەکترمان دەدیت. تەنانەت کە لە گۆشەیەکدا لە گەڕانەوەماندا کە دەمگەیاندەوە بەشی ناوخۆ ماچێکم دەکرد هیچ کاردانەوەی نەبوو بۆ سنگم بۆ وشەکانم، بۆ دەستم کە دەستی بە رێ و شوێنێکی تایبەت دەگوشی.

پێکەنینەکەی منی دەورووژاند، بەڵام بواری نەدەدام، کە بیگێڕمەوە، ئەوە رۆیشت... رابردووبوو.. ئەو رابردووەی کۆتایی هات.. دەیگوت:

- خوێندنەکەت تەواو بکە.. دوای ئەوە کاتێکی زۆرمان بە دەستەوەیە بۆ رابواردن!

- ئەی ئێستا.؟

- ئێستا وەك عاشقە بچکۆلەکان دەکەین: ماچێکی بەپەلە، دەست بەیەکدیدا هێنان... بەس نییە؟

- ئەی بۆ ئازار چی دەڵێیت؟

- من حەزم لە ئازار نییە..یەکێکی دی حەزی لێ دەکا!

- ئایا دەتوانین شتێ بکەین باولا.. بۆ ئەوەی لە عەزاب رزگارمان ببێ؟

- پێم گوتی... دوای ئەوەی خوێندنەکەت تەواو دەکەیت!

لەگەڵ باولا هیچم پێ نەکرا، لە روومدا وەستا، بوو بە منداڵێکی گەورە، بەرادەیەك کە چیتر رەفتاری نەدەکرد بۆ ئەوەی من بورووژێنێ، هەستەکانم ببزوێنێ، لێم گەڕا وردە وردە ساردبوومەوە، تا وای لێهات دۆستایەتییەکەمان بوو بە برادەرایەتییەکی بێ هودە، کە لە دەروونی مرۆڤدا خەم دەورووژێنێ بۆ رابوردوویەك کە ناگەڕێتەوە.

دوای ئەوەی دوو هەفتە تێپەڕی و بۆماوەیەکی کورت نەبێ نەمدیت، بە میرام گوت و خەریکی خواردنەوەی شەرابێکیش بووم، کە دایکی لە گوندەکە هەموو ساڵێ ئامادەی دەکرد!

- دە رۆژ.. دە رۆژ ناتبینم و بەمجۆرە دەگۆڕێیت؟

- تۆ گۆڕاویت.. ئێستا.. لە خۆم دەپرسم.. بەشەو و بە رۆژ چی روویداوە؟ زۆر لە خۆمم پرسی و تا ئێستاش نەمتوانیوە بگەمە هیچ وەڵامێك... زۆرم لا سەیرە.. وەك بڵێیت. چیتر منت ناوێ!

- میرا.. تۆ زۆر بە هەڵەداچوویت.. رەنگە ماندوویم، لەلای منەوە هیچ روونەداوە!

- ئەی لەلای منەوە هیچ روویداوە؟ ئایا شتێ لە مندا گۆڕاوە؟

- وەك جاران نەماوین میرا، شتێ لە ئێمەدا، لە هەردووکماندا گۆڕاوە، رەنگە تۆ زیاتر گۆرابیت.

- چی دەڵێ بیلێ..من خۆم دەناسم و پێت دەڵێم بە راشکاوی من نەگۆڕاوم.

- ئەی چی لە مندا گۆڕاوە.. بیڵێ!
- نازانم بەڵام خۆ دەبینی پەیوەندییەکەمان وەك جاران نەماوە!

کە دوا وشەکانی دەگوت دایکی هاتە ژوورەوە، دایکی وەك گشت دایکان وابوو ( تەمەنم شەش ساڵان بوو کە دایکم مرد، بریا نەمردایە).. دەموچاوێکی هێمن نزیك لە ڕەزابوونەوە، جموجۆڵی لەسەرخۆ و دڵنیا و ئارەزووش کە هەموو شتێ ڕێك و باش بێ.

کە وشەکانی میرای بینی تووڕە و دەموچاوی سووڕهەڵگەڕاوە. تۆزێ وەستا، پاشان بۆ لای جێگاکەوە تاکو ڕێکی بخا.

ماوەیەك بێدەنگی باڵی کێشا بەسەرماندا، هیچ شتێ نەیدەبڕی جگە لە لێدانی دایکەکە، کە سەرینەکانی دەتەکاند و ڕێکی دەخستنەوە. سەیری کردین و زەردەخەنەیەك گرتی، پاشان پرسی.

- شەرابەکەت بە دڵ بوو؟ پەرداخێکی دیکەت بۆ بێنم!
- بوتڵێکم دەوێ... بۆتڵێ لەگەڵ خۆم دەیبەم.
- بوتڵێکی گەورەم بۆت هەڵگرتووە، دەڵێی چی ئێستا پەرداخێکی دیکەت بۆ تێکەم.
- ئەگەر تۆ یان میرا لەگەڵم بخۆنەوە.. بەتەنیا نەء..
- بە هەمان شڵەژانەوە و چاوەکانی تەماشای دوو دەستە عەسەبییەکەی دەکرد، کە بەرگەی بێ مانا دەجووڵانەوە. میرا بە توندی گوتی.
- نامەوێ ناتوانم بخۆمەوە.

دایکی بەسۆزی دایکانەوە پێی گوت، ئەو دایکانەی دەیانەوێ بەرگەی هەموو شتێ بگرن بۆ ئەوەی بارسووکی بۆ ئەوانەی دیکە بهێننەدی.

- من لەگەڵت دەخۆمەوە.. بەڵام پێم بڵێ چیتان لەبەیندایە؟
- وەك گێلك پێکەنیم، نازانم بڵێم چی، سەرم لەقاندو ئاماژەم بۆ میرا کرد، میرا بێ دەنگ بوو بزاڤی دەستی نەگۆڕا و چاویشی هەڵنەبڕی. پرسیاری لێ کرد.
- میرا تۆ بڵێ... چی روویدا لە نێوانتانا ؟
- هیچ دایکە.. هیچ.

لـەو سـاتەدا هەسـتم کـرد هـەموو جیهـانم دادەتـەپی، جـاران مـیرا ئەگـەر شـتیٚ روویدابایـە و مایـەی ناخۆشـی بایـە، هەڵدەسـتا و دەسـتی دەکـردە ملـم بـۆ ئـەوەی بیسـەلمێنی بـۆ دایکـی، کـە پەیوەنـدیی نێوانمـان نەسـارد ئـەبیٚ و نـەتێك ئەچـیٚ.. بـەڵام ئێستا هەرسێکمان هەست دەکـەین، کـە هـەموو شـتیٚ کۆتـایی هـات، دارزا. مـیرا گـوتی نـادا و هەنـدیٚ جـاریش توورەیـە چـونکە نـاتوانی ئـەوەی دەیـەویٚ پێمـی بڵـیٚ نـاتوانیٚ بەیـەکجار بێڵـیٚ دایکیشـی سـەری لیٚ شـێواوە و چـاودێری کۆتاییـەك دەکـاو ناشـتوانی هیچ بکا، منیش ون و ماندوو دەمەویٚ و نامەویٚ لە هەمان کاتدا!

هەسـتکردن بـە کۆتـایی لـە بایـەکی نـاوخۆ دەچـیٚ لـە خـوێن دەدا، ڕێڕەوەکـەی دەگـۆڕیٚ، ڕایـدەگریٚ پاشـان بـە تونـدی پـاڵی پێـوەدەنیٚ، ئـەم هەسـتەش بەوەنـدەی مـرۆڤ هەستی پـیٚ دەکـا نـاتوانیٚ هـیچ شـتیٚ بکـا بـۆ ئـەوەی ڕێـی لیٚ بگـریٚ، بـەمیرام گـوت و دایکیشی لەنێوانماندا دانیشتبوو:

- دەبـیٚ دانـی پێـدابنێین مـیرا.. دایکـت کەسـێکی غـەریب نییـە و پەیوەندییەکەمان دەزانیٚ.

- تەماشـای کـردم بـە "تحـدی" وە وەك لـە هـیچ شـتیٚ نەترسـیٚ. دایکەشـی پـەرداخێکی بـە دەسـتێکی لـەرزیو هـەڵگرتبوو و تەماشـای منـی دەکـرد، وشـەکانی منیش بارودۆخەکەی ئاڵۆزتر کرد.. ئەگـەرنا بـۆ ئـەو وشـە زلانـەم هەڵبـژارد؟ ئـەم سـەرەتا توندە؟

پەرداخەکەم هەڵگرت تا ئاستی چاوم و گوتم.

- لەیادی ڕۆژانی ڕابروودا!

میرا هەستاو دەکولاّ، مـن هەسـتم کـرد هەرچـیمان لـە نێوانـدا هـەبوو کۆتـایی هـات، لچـی هەڵقورتانـد وەك منـداڵێك تەماشـای کـردم، بینـیم دەم و چـاوی گرژبـوو و دەمارەکانی لاملی هەڵاوسان، کـە دڵنیـابوو ئـەوەی ئـەو دەیویسـت دەریبـبڕیٚ مـن بینـیم، بیٚ ئەوەی یەك وشە بڵیٚ ژوورەکەی جیٚ هێشت.

لەگەڵ دایکەکـە مامـەوە.. هـەردووکمان بـیٚ دەنـگ بـووین. پەرداخـەکانمان خـواردەوە بـە خـەمێکی نادیـارەوە ( **حـزن غـامض** )پـێش ئـەوەی ماڵەکـە جـیٚ بهـێڵم، دایکەکـە پێی گوتم:

- تووڕەیی هەموو شتێ تێك دەدا.. داوای لێ بووردن دەکەم، کە ناچارم کردن لە کەش و هەوایەکی تووڕەدا قسە بکەن.

پاشان بە شێوازێکی پڕ لە سۆز وەك داوای لێ بوردن بکا گوتی: نابێ بگۆڕێی هەمیشە وەرە، میرا کە هێوردەبێتەوە دەس دەکا بە گریان و پەشیمان دەبێتەوە، بەمجۆرە دەبنەوە بە برادەرەکەی جاران و زیاتریش.

هەموو شتێ لە نێوانماندا کۆتایی نەهات، بە جۆرێك لە جۆرەکانی وەك برادەر ماینەوە، راستە وەك جاران نەبووین، بەڵام ئەو پەردە دارینەی خەڵك هەڵدەگرێ بەیناوبەین بچنە لای یەکدی هەرماوە. چەند جارێ هاتە ژوورەکەم و چەند جارێ رۆیشتمەماڵیان، ژمارەیەکی زۆری پەرداخە شەرابمان خواردەوە، بەیەکەوە نووستین.. بەڵام میرا کەمتر حەزی لە قسەکردن دەکرد دەربارەی شتەکان وەك جاران وامان دەکرد، بەڵکو هەوڵیشی دەدا بەتەنیا نەبین برادەرێ یان دوانی بانگ دەکرد و داوای دەکرد بچینە ماڵیان، نەك ژوورەکەی من.. بیرو بۆچوونی تایبەتی دەردەبڕی، کە دەکرێ بێ ماندووبوون لێی تێ بگەی.. قسەکردنیشی سەبارەت بە ماندووبوون و هەلی ژن هێنان، لەم ماوەیەدا زۆر دووبارە بووەوە. قسەکانی لەبارەی میلان بە دەنگی بەرز بوون و پەیوەندیی خۆی لەگەڵی نەشاردەوە، کە لەبەردەم دایکی باس کرا.

جارێکیان پەرداخە شەرابەکەی هەر هەموو خواردەوەو چاوی بە جۆرێکی رووبەڕووبوونەوەدا گرت، کە لێ بووەوە گوتی:

- تۆ میلان ناناسی ؟

***

لیلیان... لیلیان کۆتایی هات

لیلیان منی داڕزاند، خوێنی شڵەقاندم، تێکی دا، هەموو شتێ بوو بەوەی نەبێ، باولای بەستەزمانی بە دەنگەوە هاتوو، دوای چوار رۆژ بوو بە پشیلەیەکی هار، چیتر منی بە پیاو نەدەزانی لە چاوی ئەودا من منداڵ و پیر بووم، منداڵێکی گێل و پیرێکی بێ توانا، هیچ هێزێکی تێدانەماوە بۆ دۆزینەوەی ئافرەت و زانینی پیت و جوانی، چیتر لە بەزەیی زیاتر لای ئەو شایانی هیچی دیکە نەبووم!

بـەلاّم مـیرا.. نـەیتوانی بڕیـارێکی بەپەلـە وەربگـرێ. بمێنێتـەوە و نەمێنێتـەوە، هەیـە ونییە لە هەمان کاتـدا. یـەکتری دەبیـنین ،بـەلاّم دەسـتی  پێکـرد کـە بـە جـۆرێکی دیکـە بیربکاتـەوە. چـیتر باسـی پرۆژەکـانی دوارِۆژی نـەدەکرد، وازی لـە بـاس کردنـی دیـوانی شیعر هێنا.. چۆن چاپکرێ و ئـەو تابلۆیانـە مـن بیانکێشـم.. مـیرا چـیتر لەگـەڵ مـن بـە دەنگی بەرز بیری نەدەکردەوە!

رادمیلاش!

سەیرترین ئافرەت کـە مـن دیتـبم. لـە شـار بـوو بـەژنێکی دیکـە. زۆرجـار یـەکترمان دیـت، بـەلاّ م هەمیشـە ئیڤـان لـەوێ بـووە. لـە دواییـدا دەیویسـت دوای ئـەوەی لـە خـۆی دڵنیابوو تارادەی لە خۆبـایی بـوون، کـە لـەوێ نـەبێ.. ئیڤـان بـە خەمبارییـەوە تەماشـای دەکـردم بـەزەیی بـە بـیرو بۆچـوونە درۆزنەکانمـدا دەهاتـەوە. بـەگوێرەی ئـەویش " رادمیلا" ئـەو ماوەیـە کۆتـایی هـات. چـیاکە نـەما: بەسـەوزیی و بـە ئەسـتێرەکانییەوە، بـە هەڵپـەڕین و عەرەقەکەیـەوە، بـە هەڵپەئاساییەکەوە هـەر هـەمووی بـوون بـە بەشـێك لـە رابـردوو، ئـەم ئێسـتا ئـافرەتێکی رێـك پۆشـە، لەسـەرخۆیە لەگـەڵ پیـاوان لـەبارەی ئیڤان نەبێ قسـە ناکـا، سـلاّو زۆر بـە ئاگـاوە وەلاّمدەداتـەوە ئەگـەر تـەنیابیێ و رێگـەش نادا کەس لێی نزیك بێتەوە!

جارێکیان کـە هـەردووکمان بەتەنیشـت یەکـەوە لـەناو پاسـێکی قـەرەباڵغ وەسـتابووین پێم گوت :

زۆر زوو لـەبیرت کـرد رادمـیلا.. وام دەزانـی پەیوەنـدیی ئێمـە لـە شـاخ دەسـتی پێکرد. واشم هەست دەکرد کە شار تەنها دالّدەی ئێمەیە.. چی بوو؟

- دەبێ ئەوە بەپەلە لەبیربکەین!
- لە بە ئیڤان؟
- ئەگەر دەتـەوێ وەك بـرادەر بمێنینـەوە دەبـێ رێـز لـە ئیڤـان بگـری. ئیڤـان بـووە بە گشت جیهانی من.
- ئەی من.. بووم بە چی بە گوێرەی تۆ ؟
- برادەر..

پاشان... زوو گوتی:

- برادەری من و ئیڤان!

- بەتەنیا ناتوانین یەکتر ببینین ؟
- تۆ دەزانی ئەمە قەت نابێ!
- تا ئەم رادەیە؟
- بەڵێ.. هاوینی داهاتوو شوی پێ دەکەم، لەوانەشە بچینە هەمان شوێن!
- تۆ دڵڕەقی رادمیلا، ئەگەر دڵڕەق نەبوویتایە شتێکی دیکە دەبوویت.

هەڵی سووڕانەوەی پاسەکەم کردبە مەهانە بۆ ئەوەی خۆم بدەم بەسەر سنگیدا، ئەویش دوورکەوتەوە و رووی سوور هەڵگەڕا و ئەمجارەمەو داییکی لە نێوانماندا هێشتەوە بۆ ئەوەی نەتوانم دەستی بۆ ببەم.

مرۆڤ چییە ؟

لەخۆبایی بوونم وردوخاش بوو لەبەردەم لەخۆبایی بوونی ئیڤان.. لەبەر بڕوا بەخۆبوونەکەی.. زۆر پاشەکشەم کرد.. لە کاتێکدا ئەو لەسەرخۆ هەنگاوی بۆ پێشەوە دەنا... ئێستاش.. بیر لە ژن هێنان دەکاتەوە.. لە کوێش.. لە هەمان شوێن کە لێی را دەکرد بۆ ئەوەی هیچ بوارێك بۆ من نەهێڵێتەوە وشەیەك بە رادمیلا بڵێم!

کە پاسەکە وەستا دابەزین. بۆ دوایین جار هەوڵم داو گوتم:

- رادمیلا... کەی دەتبین؟ دەمەوێ تەنیا، ئیڤانیش ئەوا هەموو تەمەنتی لەگەڵدا دەبەیتە سەر.

- پێکەنینێکی تووڕەم لەسەر لێوەکانی بینی، وەك ئەم وشانەی لاخۆش و ناخۆشیش بێ و خەونیشی بەو تەمەنەوە دەبینی کە لەگەڵ ئیڤان بەسەری دەبا.. وەڵامی نەدایەوە.. دەستی بۆ درێژکردم و گوتی:

- ئیڤان ئێستا چاوەڕێم دەکا:

ئیڤان لەوێ بوو، لە کۆتایی وێستگەکە چاوەڕێی دەکرد. تەماشای کردین و پێکەنی، کە بینیم زۆر شەرمەزار بووم، بەرەو رووی چووم مەبەستم ئەوەبوو داوای لێبوردنی لێ بکەم، چەند وشەیەك بڵێم، بەڵام تەماشام کرد پێشم کەوت بە شێوازێك کە نزیك بوو لە رووبەڕووبوونەوە و بەهەمان شێوە کە بۆ یەکەمجار (تحدی) ی کردم، لەشەوە سەیرەکەدا، گوتی:

- دڵنیام دۆڕاندت. ئەگەر حەزت کرد جارێکی دیکە گرەو بکەی و لەسەر هەر شتێ، من ئامادەم.

توند دەستی گوشیم و بە گەرمی پێشوازیی لێ کردم، رادمیلاش لە نێوانماندا راوەستابوو، لە خۆبایی، هەستی بەوە دەکرد کە ئافرەتێکە پیاوان ئیشتیهای دەکەن! چی روویدا لەم بارەوە؟

ئەگەر باوکە پیرۆزەکان قسە، بە هەمان بڕوای (يسوع المسيح) خۆی قسەیان دەکرد و دەیانگوت: گوناه بۆ خۆی لە دەریای تاواندا نقوم بووە. ژنان، ژنانی خەڵکانی دیکە، لەرێ دەرچووەکان، بەرەڵلایی، هەموو شتێ، تیایدا هەڵەیە و ناکرێ (يسوع الناصري) شەفاعەتی بۆ بکا؟ چۆن داوامان لێدەکەن نەفسێکی تاوانبار رزگاربکەین؟ چۆن دەتانەوێ لێمان گوێ بگرین لەدان پیانانی پیاوێك کە رۆحی پیس بووە و قەت پاکیش نابێتەوە، تەنانەت لە دۆزەخیش.

با باوکان چی دەڵێن بیڵێن، ئەوان ئەو مافەیان هەیە، ئێوەش دەتوانن چیتان دەوێ بیڵێن. هەرچەندە ئێوەش وەك من لە گوناهدا مەلە دەکەن. ئەوانەی لە خەڵك خۆش دەبن، ئەوانە پیرۆزن لە ئاسمان، بڕواناکەم کەسیشتان بیەوێ پیرۆزبێ. جیاوازیی نێوانمان ئەوەیە من دانی پێدا دەنێم بە جۆرێ لە جۆرەکان بۆ لایەنێك، بەڵام ئێوە ئەوە ناکەن.

جارێکیان زیاد رۆیشتم. ویستم قسەیەك بکەم، چووم بۆ کەنیسە و هەوڵم دا دانی پێدابنێم. بەڵام هەوڵەکەم (یەکەمجارە ئەمە دەڵێم) پیس بوو و پڕ بوو لە تاوان. جارێکیان شێوەی لیلیانم بە دواوە بوو، شەوو رۆژ، بڕیارم دا بچم بۆ کەنیسە.

هەستم تێکچووبوو ونەفرەت لێکراو بوو. مومێکی گەورەم کڕی و دامگیرساند پاشان لەسەرخۆ وەك پشیلە چوومە پێشەوەو لەلای (المزبح) ەوە دامنا، دوای ئەوە چوومە ئەو ژووره نزمە بچووکەو بڕیارم دا (اعتراف) بکەم.

پەرژینەکە لە نێوانمان بوو، هەستم بە هەناسە قورسەکانی کرد شوێنەکەی پڕکردووە، بێ ئەوەی بەباشی ببینم، وای بۆ چووم کە قەڵەو بێ و تاوان لە سنگیدا ئەسووتێ، وەك سووتانی ئاگری داخ لە دڵان لە خەرمانی هەژاران. پێم گوت:

- باوکە لێم ببوورە. من پیاوێکی تاوانبارم، تاوان ئازارم دەدا و دەیەوێ تۆبە بکا!

گوێم لە دەنگە قورسەکەی بوو بە دڵنیاییەوە دەیگوت

- "یسوع المخلص" کوڕی خوا، له هەموو تاوانەکانت خۆش دەبێ. منیش گوتم:

- بەڵام تاوانەکانم زۆرە بەرادەیەك کە "یسوع المخلص" لێم نابورێ!

بەشێوازێکی توند وەڵامی دامەوە:

- دانی پیابنێ کوڕم و "یسوع" لە هەموو شتێ دەبورێ!

- حەزم لە ژنێکی مێردار کردووە. تا ئێستاش خۆشم دەوێ و ناشتوانم بۆ یەك ساتیش دەس لە خۆشەویستییەکەی هەڵگرم، چی بکەم؟

دەنگی پەشۆکابوو، کە پرسی:

- لە کەییێکەوە خۆشتدەوێ ؟

- لەوەتی لە دایك بووم.

- مێردی هەیە؟

- بەڵێ... بەڵێ باوکە.

بەشێوازێکی توند گوتی:

- بەڵام بۆچی کوڕم؟ ئایا گوێت لێ نەبوو" یسوع المخلص" چیی گوت، کە ڕێی نەدەدا تەماشای ژنی خەڵکی بکەیت.

- بەڵام من ئیشتیهام نەکردووە باوکە و بیریشم قەت لە شتی پیس نەکردووەتەوە.

- ئەی خۆشەویستی ؟

- خۆشەویستی بە پاکژی و دەمەوێ بە پاکژی بمێنمەوە.

- ناکرێ کوڕم. تەماشاکردنی ژنانی خەڵکی دیکە تاوانە، جگە لە خۆشەویستیش.

- بەڵام ناتوانم ئەی باوکی پیرۆز، (یسوع المسیح) مانای ئازاری مرۆڤ تێدەگات.

- (یسوع المخلص) چی دەتوانێ بکا بۆ پیاوێ نەیەوێ واز لە تاوان بهێنێ.

- چ گوناهێکە من ئەم ژنەم خۆش بوێ، ئەی باوکی پیرۆز؟

- گوناه گوناهە. تەنها بیرکردنەوە لە ژنێکی دیکە، ژنێکی بە مێرد. ئەوە کەوتیتە گوناهەوە، دەبێ هەرچی دەتوانی بیکەی بۆ ئەوەی روحت رزگاربکەی.

وەڵامم دایەوەو بەڵام كۆتایی وشەكانم درێژدەكردەوە تاكو بیورووژێنم:

- دەبێ چی بكەم... ئەی باوكە مەزنی پیرۆز.

بەبێ تاقەتی و بەدەنگێكی بێزارو تووڕە گوتی.

- واز لە خۆشەویستی ئەو ژنە بهێنە.

- بەهەمان شێوەی بێ ڕێزییەوە،گوتم:

- ئەگەر نەمكرد.

- دەمێنیتەوە و لە تاوانـدا نقـوم دەبـی. سـزای تاوانەكـەت لـە خـواو لـە ویـژدانت وەردەگری.

- بەڵام من تاوانم نەكردووە ئەی باوكی پیرۆز.

- تۆ تاوانباری كوڕم. بەڵام هەست بە تاوانەكەت ناكەیت!

- پێت دەڵێم من تاوانم نەكردووە و ناشمەوێ واز لە خۆشەویستی بهێنم.

- كەواتە روحت كەوتە ناو تاوانی بكوژ، هیچم پێ ناكرێ بۆت.

هاوارم كرد، دەمویست فشاری بخەمە سەر شتێك بكا.

- دەبێ شتێك بكەی ئەی باوكی پیرۆز.. دەبێ شتێ بكەی!

- تۆ دەبێ شتێ بكەی.. واز لە خۆشەویستی ئەو ژنە بهێنە.

- بەڵام ناتوانم. هاتووم خۆشەویستەكەم.پیرۆز — تبارك — كەی!

- دڵت بدە بە "يسوع المسيح" ئەو رزگارت دەكا.

- خۆشەویستیەكەم پیرۆز دەكەی ؟

- روحت رزگاردەكا.

- بەخۆشەوستی؟

- بەوەی واز لەم ژنە بهێنی.

- بەڵام نامەوێ واز بێنم ئەی باوكی پیرۆز.

- كەواتە دەرگاكانی ئاسمان لە رووتا داخراون و "يسوع روحت رزگارناكا"

- ئاسمانم ناوێ و "يسوع المسيح" یشم ناوێ!

- تۆ لاتدا كوڕم، نابێ بەمجۆرە قسە بكەی.

- ئەی تۆ چـی لـەبارەی خۆشەویسـتی دەزانـی ئـەی بـاوكی پـیرۆز ؟ دەتـوانی چـی بە مرۆڤ بدەی تاكو لە عەزابدا نەژین؟

- تۆ توورەی کورم ، دڵیشت پڕە لە گوناه.

- توورە نیم، بەڵام من هاتم بۆ ئەوەی خۆشەویستەکەم پیرۆز کەی.

- من تاوان پیرۆز ناکەم.

- ئەی چی پیرۆز دەکەی؟

- رۆحی پاکژ، رۆژی مرۆڤ کە باوەش بە "يسوع المسيح" دا دەکا تاکو رۆحی پاك بێتەوەو لە تاوان رزگاری ببێ.

- پێم گوتی من خۆشەویستی ئەم ژنە بە گوناه نازانم.

- تۆ هەڵەی و دەبێ تۆبە بکەی.

- هەڵەنیم و تۆبەش ناکەم!

- بڕۆ کورم. دەبێ رۆحت لە عەزاب دابێت و لە عەزابدا بخنکێت. دەبینی دەرگاکانی ئاسمان لە رووتدا داخراون و کەس رزگارت ناکا.

- گوێ بگرە ئەی باوکی پیرۆز.. یان خۆشەویستییەکەم بۆ ئەم ژنە پیرۆزکەی یان کفر بە کەنیسە و "يسوع المسيح"یش دەکەم.

- تۆ کافر و گوناهکاری.

- من لە "يسوع المخلص" ئازارم زیاترە ئەی باوکە.. هەموو رۆژی دەمرم، هەموو ساتێ لە خاچ دەدرێم، ئازار ئەچێژم، پێم بڵێ چی بکەم.

کەنیسە بۆ من چیی پێ دەکرێ.

- بڕۆ کەنیسە پێشوازی لەوانە ناکا، کە شانازیی بە گوناهەوە بکەن.

- ئەڕۆم ئەی باوکە. بەڵام لێشتان خۆش نابم. ئێوە ئەی باوکانە، پیرۆزی نازانن چییە، "يسوع المسيح" ناناسن، تەنها ورگی خۆتان دەناسن و تاتەپڵی سەرتان لە گوناهدا نوقمن..

ئەگەر "مەسیح" بامایە هەموو باوکانم لە خاچ دەدا و دەمخنکاندن. رۆژێ دێ وابکەم، دڵنیابە وا دەکەم!

لە هەموو ئەوەی بە باوکی پیرۆزم گوت، گاڵتەم دەکرد، دەمزانی روحم تاوان نازانێ (تا ئێستاش هەر نایزانێ) جا ئەگەر پەیوەندیم لەگەڵ ژناندا هەبێ، ئەمە پەیوەندیی بە کەنیسەوە نییە. ژنان بۆ خۆیان لەم پەیوەندییە رازین.. کەنیسە بۆی نییە بێتە نێوان ئەو ژنەو پیاوانەی یەکتریان خۆش دەوێ و بەیەکیشەوە دەخەون.

تەماشـــای "المـذبح" م كــرد، كـــە چـــوومە دەرەوە هێشـــتا "العــذراء" منداڵـــە بچـووكەكەی هـەڵگرتبوو و بەبێزارییـەوە دەیڕوانـی، مۆمـەكانیش لەبـەر بایـە ساردەكەدا ئــەملاو ئــەولایان دەكـرد لەگــەڵ بــۆنی بخـورو وێنــەی باوكــە پیرۆزەكــان. پیــادە بــە تەمەنـەكان و پیرەژنـەكان و هەنـدێ كچـی بچـووك.. تـەنها زینـدەوەرێ بـوون، كـە لـەوێ بوون!

* * *

لیلیـان و شـار وایـان لـێم كـرد بـەو جـۆرە رەفتاربكـەم بەرانبـەر ژنـان و بەرانبـەر كەنیسەش، كـە گەڕایـەوە شـار بـەرێ و شـوێنێكی تـازە هەڵسـوكەوتم دەكـرد. لیلیـان بـۆ من زیاتر لە راستییەك بـوو، لیلیـان و ئـەو چـاوانەی پـڕن لـە لێبـوردن و خۆشـی و ئـازارو پەشیمانی.

لەبــەیانی زووەوە ئــەو گۆرانییــە دەس پــێ دەكــا كــە كۆتــایی نییــە: لیلیــان.. كــوا لیلیان.

جارێكیان لە رادمیلام پرسی، ئیڤان گوێی گرتبوو و سەری دەلەقاند:

- رادمــیلا ژنێكــی جوانــت لــەبیرە، كــە دوو منــداڵی هــەبوو، لەگــەڵمان بــوو لەشاخ؟

- جوان و دوو منداڵ؟

- جوان و دوو منداڵ!

- ئەی جگە لە جوانی و منداڵ؟

- دوو چـاوی سـەوز، لـوتێكی بچـووك، یۆنـانی، ناوچـەوانێ نـە زۆر پـان و نـە زۆر تەسك، لە نەرمییەوە نزیكتر بوو، كورتە باڵانەبوو، بەڵام لە ژنە باڵابەرزەكانیش ناكا!

- دەتــەوێ جنیۆبەیــەكێ بــدەی یــان بەشــدار لــە پێشــبڕكێی وشــە یەكتربڕەكانــدا بكەی؟

- گاڵتەناكەم، بەڵام نازانم چۆن وەسفی بكەم بۆت.

- شـێوەی بـە گشـتی چـۆن بـوو؟ لـە كـوێ دادەنیشـت؟ جلـەكانی ئایـا جلـەكانیت لەبیرە؟

- پێم گوتی چاوم لەو جوانتری نەدیوە!

- ژنێكی وا جوانمان لەگەڵ نەبوو!

- زۆر جـــوان، لەســـەر رووی زەوی جـــوانی دیكـــەی وانییـــە، ئیڤـــان بـــە گاڵتەجاڕییەكەوە گوتی:

- چیرۆكی ئەم ژنە زۆر جوانە چییە؟

- تۆش ئیڤان لەوانەیە ئەوت دیبێ و شاگەشكە بووی،

- رادمیلام بەسەر، كەسم نەدیوە، ناشمەوێ لەو جوانتر ببینم.

رادمـیلا دووبـارە لێـی پرسـیمەوە، كـاتێ هەسـتی كـرد قسـەكانم بـە خـۆڕایی نـەبوو. گوتی :

- زۆربەی ئەو ژنانـەی لەگـەڵمان بـوون لـە شـاخ دێنـەوە بـیرم ئەگـەر هـەوڵ بـدەی بۆمی وەسف بكەی دێتەوە بیرم!

- مێردەكەی قەڵەوە. باڵای بـەرزە، زۆرتـر لـە مێـزی ژمـارە سـێ دادەنیشـتن نزیـك بالكۆنەكە.. دێتەوە بیرت؟

- چی لەبەردەكرد پێم بڵێ توخوا؟

- كراسـی لەبـەردەكرد وەك هـەموو ژنـێ. جارێكیـان بینـیم (مـایۆ) یـەكی زەردی لەبەردابوو!

- رەنگی كراسەكەی؟ پێڵاوەكانی ؟ جانتاكانی؟

- ژنەكەم لەبیرە. چیترم لەبیر نییە.

- ئەی چۆن دەتەوێ من بیناسم؟

- چونكە زۆر جوان بوو، كەسیش ناتوانێ لەبیر خۆی بباتەوە!

- رادمیلا ئاوڕی لە ئیڤان دایەوەو لێ ی پرسی:

- خۆشەویستەكەم تۆ بینیت؟ ئەو ژنەت لەبیرە؟

- وڕێنـــە... خـــەون.. چـــۆن لـــەبیرم بـــێ كـــە مـــن دە رۆژە لـــە تـــۆ زیـــاتر كەســـم نەدیوە... بەڵام ئەگەر ئەوەندە جوان بووبێ وەك باس دەكا دەبێ دیبێتم!

- لە پڕ ئیڤان لێی پرسیم بە هەمان شێواز، كە قەت نەیگۆڕیبوو.

- ئەی ئەم ژنە؟

- دەگەڕێم بەدوایا!

- چیت لێی دەوێ؟

- ئەگەر وشە خەتەرکە بەکاربهێنم، لەوانەیە هەڵە بکەم، بەڵام حەزم لێیەتی!
- خۆشت ویست، ئێستاش دەتەوێ ژیانی وێران بکەی؟
- ئیڤان.. بۆ خاتری ئاسمان واز لە گاڵتە بێنە. تۆ سووکایەتی بە سۆز دەکەی. دانی پیدانانێی، بەتایبەتی ئەگەر سۆزی کەسێکی دیکەی غەیری خۆت بێت. بەڵام ئەگەر هی خۆت بێت. شێت بوونت بۆ رادمیلا، کامە گاڵتەجاڕی کام قسە لەبارەی ئەو مەسەلەیە.. بێزارت دەکا.لێم گەڕێ. با هەموو شتێ نەڵێم!
- جا دەتەوێ بڵێی چی؟
- هیچ.. هیچ.. هەڵەم کرد و پرسیارم لە رادمیلا کرد!
- ئایا ناویت زانی؟ قسەت لەگەڵ کرد؟ چیتان لە بەینێدا هەیە؟

رادمیلا ئەم پرسیارانەی زۆر بە سۆزو خۆشەویستییەوە لێکردم، کە من لەو چەند مانگەی بەیەکەوە بووین لە شاخ شتی وام لێ نەدیبوو تا ئێستا. بۆ ئەوەی کۆتایی بە قسەکان بێنین گوتم:

لە راستیدا ویستم یادەوەرتیا تاقی بکەمەوە، هیچ. نە خۆشەویستی و نەگەڕان. ئەوەی هەیە ویستم بزانم مرۆڤ تاچ رادەیەك شتی لەبیر دەمێنێ.. ئایا هەمان کاریگەر لە یادەوەریدا جێ دەهێڵێ!

رادمیلا بڕوای بە قسەکانم نەکرد، ئیڤان لەگەڵ برادەرێکدا قسەی دەکرد، کورسییەکی بەرەو پشتەوە نوشتاندبووەوە وقسەی لەگەڵدا دەکرد.

لەو ساوە سەبارەت بە لیلیان لەگەڵ کەسدا قسەم نەکرد!

پێش ئەوسا، دوای ئەوساش، زۆر بیرم لە لیلیان دەکردەوە. بە دوایدا گەڕام، خەونم دەدیت بەیەکەوە دەڕۆین.. بەیەکەوە مەلە دەکەین.. پاشان خەونم دیت لە دەریاچەکە ون بووین، لەسەر شاخ هەروەها خەونم دیت کە بەیەکەوەین لە شوێنی تاریکدا و لە ژێر باراندا. خەونم دیت ئێمە لە ژێر زەمینێکی فێنکداین، شەراب و ماسی بچووکمان پێشکەش دەکا. لیلیان سەری دەخستە سەرشانم و پێدەکەنی.. جارێکیان بینیم گریا باوەشی پێدا کردم و هەستم کرد ئێسقانەکانم وردو خاش بوون. وام لێهات نەمدەتوانی شەوێ تێپەڕی و نەیبینم.

بەڵام رۆیشتن بۆ کەنیسە دوا گاڵتەجاڕی بوو، کە مرۆڤ بیریان لێ بکاتەوە!

لەشاری گەورەدا، کە سەدان منداڵ ڕۆژانە لە دایك دەبن ڕۆژانەش سەدان کەس دەمرن. لە شاری گەورەدا خەڵك زۆرن رادەکەن، پێدەکەنن، لە چایخانەکان و چێشتخانەو بارەکاندا دادەنیشن. بەخەمەوە قسە دەکەن. بە خۆشی دەچنە هەموو شوێنەکان. بیردەکەنەوە. خەون دەبینن. خۆشەویستی دەکەن ژن دەهێنن و شوودەکەن.. هەروەها حاڵەتی خۆ کوژی و شێتی لە شارە گەروەکاندا زۆرە.

لەوەتی پێم خستوەتە شار لیلیان بووەتە خولیام. گەر لە شاخ لەوە دوورتر بێ مرۆڤ دەستی بۆ بەرێ یان سەیری چاوەکانی بکا، ئەوا شاری گەورە هەموو شتێ دەشارێتەوە و هەورێکە بە هەڵەداچوان و سووکایەتی پێ کراوان دەشارێتەوە، لەوانەشە بێزاری وایان لێ بکا خۆیان لە پەرداخێکدا یان ماچێکدا یان دەست لە گرتنێکدا لەبیربچێ.. ئەمە ئەوە بوو کە بیرم لێ دەکردەوە. ئەمە ئەوە بوو کە هەوڵم بۆ دەدا لە و شارە نەفرەتییەدا.

کە پێم نایە سەر شۆستەی وێستگەکە ئاواتەکانم گەورەتر بوون، ئەو گوڵە سوورەی میرا هەڵی گرتبوو یەکەم مژدە بوو. هەناسەکانی ژوورەکەدا زەردەخەنەیەکی ناسك بوو لە خەونە تازەکەمدا. ئەو شەڕانەش شەڕە بێ دەنگەکان کە لە نێوان من و میرا، پاشان من و پاولادا روویان دا هۆیەکانی لە خوێنمدا دەگەوزان وەك گیانەوەری بەندکراو. زۆر خەمم نەخوارد کە باولا رۆیشت، میراش کە دەڕۆیشت و دەهاتەوە وەك گەشتیار وابوو، کە زۆر راناوەستێ لەم وێستگە ونەدا.

دەبێ لیلیان لە کوێ بێ؟

دەبێ دیقەتی دەم و چاویدەم، دەبێ ببیینم. گەڕانەکەم زۆر ناخایێنێ.. لێرە ئەگەر یەکترمان بینی هەست بە ترس ناکەین، چونکە شارە گەورەکان دانیشتوانی دەپارێزێ و بەرگرییان لێ دەکا بەجۆرێکی زۆر باش، بەڵام لە شاخ کە مرۆڤ تەنیا و گۆشەگیر دەبێ ناتوانێ هیچ بکا جگە لەوەی ترسەکەی بەم بێدەنگییە داپۆشێ، دیدارە تۆ بەکارەکانی چاوانی مێرد کە پڕە لە هاوار لە چاوی ژندا!

دەستم کرد بە دانشتین لە چایخانەکان، خۆم بە چایخانەیەکی تایبەتەوە نەبەستەوە. چایخانەی داهاتوو چایخانەی ئەوە و دەبێ بێت. ئەگەر لە چایخانە

دانەنیشت دەچێ بۆ سینەما. جا ئەگەر لە دوو کاتی جیاوازیشدا بێین باشتر وایە ماوەیەك دانیشتم، چاودێری ئەوانە بکەم، کە دەچنە ژوورەوە و دێنە دەرەوە. بەشکو لەناویاندابێ. لیلیان حەزی لە فیلمە. وای بۆ دەچم هەڵەش نیم، ئەگەر چووم بۆ سینەما و ئەو چووە شوێنێکی دیکە، ئایا لەگەڵ منداڵەکان ناگەڕێ لە باخچەیەکدا؟ ئایا تەماشای پەیکەرەکان ناکا لە جادەکان؟

گەشتی تازەم لە شار دەستی پێکرد، چیتر هەوەسی ژنانم نەبوو مەگەر بەقەد ئەوەی یەکێکیان لە لیلیان بکات. بەم لێکچوونە دەمویست لە لیلیان نزیك ببمەوە. تەماشای دەم و چاوەکان دەکەم کە دڵنیابووم ئەوسا ملی رێ دەگرم و دەڕۆم، بێ ئەوەی هیچ لەدوای خۆم بەجێ بێڵم ئارەزووکانم پیشان بدەن!

ئەم جادەیەی ئێستا پیایدا دەڕۆم، لیلیان هەزار جاربەسەریدا تێپەڕیوە، کەی خوایە (ماوەیەکە ناوی خوا دەڵێمەوە.. بەلام بەبێ هۆش). ئەم پەیکەرەی دووبارە خراوەتەوە گۆڕەپانە گەورەکە دەبێ لیلیان دیبێتی بەلام خوایە ئەمە کەی بووە؟ سینەما.. کام سینەما؟

کەس بڕوا دەکا کە لیلیان نەهات بۆ سینەما؟ باخچە.. و چایخانە.. هەموو ئەو شوێنانەی جێی هەزاران کەسی تێدا دەبێتەوە، بڕواناکەم لیلیان نەهاتبێ! هاتووە وەستاوە.. دانیشتووە.. بەلام کەی ئەی خوایە؟ دەمەوێ بزانم کەی هاتووە، ئایا تەنیا بووە ؟ لەگەڵ برادەرێ؟ لەگەڵ مێردەکەی ؟

ئەی پاص و ترامەکان.. بۆچی بەکاردێن؟ بۆکێ؟ لیلیان کامە هێڵ هێڵی ئەوە؟ دەیەم؟ بیست و حەوت؟ تۆ ؟ کێ پێم دەڵێ؟

لە شاخ هەستم بە هەناسە بۆن خۆشەکەی دەکرد، تەماشاکردنەکەی کە شووشەکەی دەبڕی، ڕۆیشتنەکەی.. بەلام لێرە دەمەوێ رێگەیەك بدۆزمەوە بتوانم بگەمە لای.

هەموو رۆژێ تەماشای رۆژنامەم دەکرد و دەشزانم هەمان رۆژنامەبەژێرچاوی لیلیاندا تێدەپەڕی.چەندژمارەیەکە لەو رۆژنامەیە لای مێردەکەی دی. ئەگەر رۆژانە دەیخوێنێتەوە، چی دەخوێنێتەوە؟ سیاسەت ؟ هەواڵەکانی جیهان؟ هەواڵەکانی هونەرو تەلاق و خۆکوشتن؟ کێ یارمەتیم دەدا تابتوانم بگەمە لیلیان؟

تەلەفزیۆن.. لە هەمان شاردا تەماشا تەلەفزیۆن دەکەین، هەمان رۆژنامە دەخوێنینەوە، زۆر جار هەمان فیلم دەبینین، جادە سەرەکییەکان دەبێ لیلیان پیایاندا بڕوا، ئەگەر هەموو رۆژێ نەبێ دوو رۆژ جارێ، منیش هەمان شت دەکەم لەو کەمتر لەو زیاتر بەڵام دەڕۆین.

کەمەکەمە شار بوو بە دوژمنم. خەونەکانم رەوینەوە.. ئەو رەشماڵە گەورەیەی وامدەزانی شار هەلیدەدا بۆئەوەی خەڵك خۆر لێیان نەدا بووبە چۆڵەوانییەکی رەنگ زەرد، جادە قەڵەباڵغەکان، چۆڵە، سینەما کە پێشوازیی لە خەڵك دەکرد، هەموو رۆژێ ئێستا تەنها هۆڵی سارد کە باو خێو تیایدا یاری دەکەن، چایخانە، رۆژنامە، تەلەفزیۆن، هەر چ شتی دیکەی شار هەبوو مانای نەما!

ئایا لیلیان تا هەتا هەتایە کۆتایی هات؟ ناکرێ شار ببێ بە بوونەوەرێکی بەرەحم یەك جار و پاڵ بە لیلیانەوە بنێ بەرەو جادەکە، بەرەو باخچە، بەرەو چاپخانە؟

ئەی شار تۆ خەڵك دەزێیت پاشان دەیانکوژێت، خۆشەویستی دەخولقێنی کە گەورەبوو و بووە دۆزەخ ئەیخنکێنی، بێ رەحمانە لەت لەتی دەکەیت.. ئەی شار.. مۆسیقا دەزانێ.. کتێب چاپ دەکەی، تا کە مرۆڤ لە شارستانیەکەت تێردەبێ. ویستی شتێ بکا وەك کتێب دەڵێ یان وەك لەسەر شاشە دەبینرێ! گاڵتەت بەم زیندەوەرانە کرد، کە دەیانەوێ شتێ لەوانەی لە تۆوە فێری بوون لە دواتەوە بیلێینەوە.

رۆژێکیان لە خۆرا وا ترامی یەکێك لەوێستگەکان وەستا و بە زووترین کات نەفەرەکانی سوار کردو رۆیشت، لەو ساتەدا لیلیانم بینی، رامکرد، خەریك بوو ترومبێلێك بمکا بە ژێرەوە، بەڵام هەموو شتێ زۆر زوو کۆتایی هات. ئایا لیلیان دەستمی بینی، کە بۆی بەرزم کردبووەوە؟ ئەو ترۆمبێلەی بینی، کە لایدا لای راست بۆ ئەوەی من نەکا بە ژێرەوە؟

بەپەلە چوومە وێستگەی دوای ئەو جگە لە ژنێکی سەرخۆش، کە بە زۆر چاوی بۆ دەکرایەوەو لیکاو بەسەردەم و چاوییەوە دەچۆڕا، کەسی دیکەی لێ نەبوو، ئەی لیلیانی پیرۆز؟ و پەرۆش چەند حەزم دەکرد لەو ساتەدا زەوی قووتم بداو بمکا بە زەرەی بچووکی ناو هەوادا ون بوو.

بۆچی هەموو شتێ کۆتایی هات؟

بەڵام لە ساتی خەمی بێ کۆتایی، ساتی ئازار کە هێرش دەبا وەك تۆفان، چاوی لیلیان دووبارە دەبریسکایەوە و سەرەتای ڕێگای زانی، بەڵام کامە ڕێگە بوو ئەوەی ئەو زانیی، ترامەکەی؟ بەڵام لە هەمان وێستگەوە کە لیلیانم تێدابینی سێ خەتی ترام دەڕۆیی: حەوت، دە، یازدە، کامە هێڵ هێڵەکەی ئەوە خوایە گیان، گرنگ نییە دەتوانم بیدۆزمەوە، چاوەڕوانییەك لە وێستگەی سەرەکی بەسە بۆ ئەوەی چاوم بە لیلیان بکەوێ، ئیشەکە زەحمەت نییە.

زۆر چاوەڕێم کرد.. هەموو سەعاتەکانی ڕۆژ چاوەڕێم کرد ترامەکە دێ و دەڕوا، حەوت، دە، یازدە، هەزاران کەس گەیشتن، هەزاران کەس سواربوون و دوورکەوتنەوە، لیلیان نایێ، دەکرێ لە وێستگەی پێش کۆتایی دابەزێ؟ یان ئەوەی پێش ئەو ؟ ئەو جارە نەچووە سەردانی دایکی ؟ پوری؟ شێت دەبم و چاوەڕێ دەکەم، هەموو ترامێ بوو بە دوژمن، هەموو دەم و چاوەکانیش لای من ڕەزاگران و گاڵتەجاڕبوون!

چی بکەم؟

هێڵی ترام گاسنی سەرەکی بوو، کە ئێسقانەکانمی دەبڕی. بۆ هەر کوێ دەچووم سەرەتای ڕێ و کۆتاییەکەم دەکرد و بە هێڵی ترام. ئیشەکە قەت وانەبوو، لە هەموو وێستگەکانەوە سواربووم، بەشکو لەوێ بێ، لەو پارچە زەوییە بێ، لەوانەیە لەم ساتەدا دەچێ بۆ شت کڕین. یان لەگەڵ منداڵەکان دەچێتە باخچەکە. دیسانەوە دەستم بە گەڕان کرد لە چایخانەکان، لەبەردەرگای سینەماکان، لە باخچەکان و دووەموچاوی لیلیان دێتەبەر دیدەم و ون دەبێ و رادەکا.

ڕۆژێکیان لە قەدەری گاڵتەجاڕ ببوورن، ئەگەر دەتوانن، دەمویست سواری پاس بم، لە وێستگەی هاوتەریبی وێستگەی ترامەکە. ترامەکە راوەستا، لیلیان لەو بەرەوە بوو، بە هێمنیەکی خەمبارەوە تەماشای چادەکەی دەکرد. پێش ئەوەی ئەو من ببینێ. من ئەوم بینی، سەری بەرزکردەوە وەك هەستی بە شتێ کردبێ.. کەسەری بەرز کردەوەو منی بینی ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، شڵەژا، خەریك بوو هاوار بکا، بەڵام تەنها بە دەستی ئاماژەی کرد و دەستی راوەشان بە

جۆرێکی سەیر. ئایا بڕوا دەکەن من خەریك بوو شێت بم کە پاصەکە جوولا؟ شوێنەکەم بە زوو بە جێ هێشا، بەلاّم دەبایە چاوەڕێی وێستگەی داهاتوو بکەم.. کە دابەزیم با هەلّیکردبوو، تڕامیش شوێنەواری دیارنەبوو. هەموو شتێ.. هەموو شتێ بە تەواوی کۆتایی هات.

ئایا رابکەم بە دوایا؟ راوەستم تا دێتەوە ؟ خوای ئاسمان بۆ کوێ چوو؟ زەڕەبیێك هەوام دەوێ، ئومێد بۆ ئەوەی نەمرم.

ئایا دەکرێ هەموو جارێ ترامەکەی بڕواو نەمبینێ؟ ئەگەر بشمبینێ جادەکە پان و لێکمان جیادەکاتەوە، پاشان ئەو ئامێرە دلّڕەقە دەبزوێ و هەر یەکەمان فڕێ دەداتە لایەك و رێگەیەك و هەلێکم بۆ ناهێلّێتەوە بۆ ئەوەی وشەیەك بلّێین، یەك وشە!

چاوەڕێی ترامی داهاتووم کرد، قاچم وەك قاچی سوار رادەوەشاند، دەمەوێ ترامەکە زەوی ببڕێ، بیسووتێنێ تاکو زوو بگا، لە هەموو وێستگەیەك کە پێیدا تێدەپەڕین وەك سوالّکەر تەماشای دەم و چاوەکانم دەکرد، لە دوا وێستگەدا سێ پیاوو منداڵێکی لێ بوون و کەسی دیکە نا، ئەمە چ ترامێکە؟ ژمارە (٥) بوو.

ترامی ژمارە (٥) سەرەتاکەی لە کوێیە؟ کۆتاییەکە لە کوێیە؟ ئایا لیلیان لە مالّێك لەسەر ئەم هێلّە نیشتەجێیە؟ هەموو ناوچەکە گەڕام... بەپێ گەڕام.. تەماشای پەنجەرەی مالاّنم دەکرد، باخچە.. زۆر وەستام بەرانبەر پەیکەرێ دەمەوێ قسەم بۆ بکا. بەو ئومێدەی تەنها شتێ بێ کە شتێکم پێ بلّێ یان بمبا بۆ لای!

لیلیان دەرناچێ، زۆر دەرناچێ، ئەگەر نا هەر دەمدیت، لیلیان لە چایخانە دانانیشێ، ناچێتە سینەما، چونکە ئەگەر وابوایە دەمدیت. تەنانەت پێویستییەکانی مالّیش بە تەنیا ناکڕێ، لەوانەیە یەکێ یارمەتی بدات لە کڕیندا، لەوانەشە بۆماوەیەکی زۆر شت بکرێ، چونکە وانەبایێ دەمدیت.

نازانم بۆ بیرم لە شانۆ کردەوە، وەك موعجیزە ئەو بیرۆکەیەم بۆ هات، وەك هێلّێکی تیشکدار، وام بۆ هات کە دەبینم لەبەردەممدا لە سالۆنی دەرەوە راوەستاوە. بەیەکەوە جگەرە دەکێشین و تەماشای دەم و چاوەکان دەکەین بێ وشە. نەمدەویست وشە خۆشییەکەم بۆ یەك ساتیش بێ، لێ تێك بدا، بەسمە

تەماشای بکەم، تەماشای ئەو دوو چاوە گەشە بکەم، بەسمە یەك جار بیبینم و چیترم ناوێ لەوە زیاتر.

سەعات هەشت بلیتی شانۆم وکڕی و لە سۆچێکەوە وەستام، نزیك دەرگای سەرەکی، وەك زۆر کەس وا دەکەن، چاوەڕێم کرد، لە هەشت تێپەڕی و پڕ بوو لە ئازارو چاوەڕوانی، هەشت و دەقیقەیەك و دوو دەقیقە، هەشت، دە دەقیقە.. کە گەیشتە هەشت و نیو کاتی هەڵکردنی پەردەی دیارنەبوو. ڕەنگە کەمێ دواکەوتبێ، دەتوانم چاوەڕێی بکەم، هەمووان هاتن، تەنها ئەو نەهات، چی دوای خست؟ ئایا نەخۆش کەوت؟ ئایا مێردەکەی دوا کەوت، ئەم ئێوارەیەی تێکدا، کە بە درێژایی دوای نیوەڕۆ خۆی بۆ ئامادە دەکا.

هەموو ئەوانەی چاوەڕێیان دەکرد چوونە ژوورەوە، ئەوانەی چاوەڕێیان دەکرد پیاو بوون، زۆربەیان پیاو بوون، بەڵام چەند ژنێکیشم بینی، پیاو و ژنەکان هاتن و هەمووان چوونە ژوورەوە. لیلیان نەهات.. هەر خۆم مامەوە.. دەکرێ منیش چاوەڕێ بکەم، هۆبەکانی هاتوچۆ، شتە بچووکە چاوەڕوان نەکراوەکان، منداڵان... ئایا یەکێ لە منداڵەکانی نەخۆش کەوت و نەیهێشت بێت؟

کە سەعات بوو بەهەشت و چل و پێنج دەقیقە چوومە ژوورەوە، لە ساڵۆنە دەرەکییەکەدا تا کۆتایی فەسڵی یەکەم چاوەڕێم کرد. شانۆگەرییە بە هەرسێ فەسڵەکەیەوە کۆتایی هات بێ ئەوەی من ئاگام لێی بێ.. گەردنی لیلیانم ئازاد کرد. دەبێ شتێ دوای خستبێ.. دەنا هەر دەهات.

دوای هەفتەیەك جارێکی دی چوومەوە بۆ شانۆ ، مەبەستم بوو ڕۆژی شەممە بێت، چونکە زۆر کەس ڕۆیشتنیان بۆ شانۆ دەکەنە بۆنەیەك بۆ کۆتایی هێنان لە هەفتەیەك، کە پڕبوو لە ماندووبوون و چاوەڕوانی... دەبێ لیلیان بەدرێژایی ئەم هەفتەیە زۆر ماندووبووبێت: منداڵ، مێرد، ماڵ، شتی بچووك کە لە ژماردن نایێ.. هەموو شتێ ژن ماندوو دەکا..ڕۆژی شەممەش ڕۆژی کەوتنی ماندووبوونە.. ڕۆژی خواو عاشقەکان!

بلیتێکم لە بازاری ڕەش کڕی. تەماشای تەختەی پڕوپاگەندەکەم نەکرد تاکو ناوی شانۆگەرییەکە یان ناوی ئەکتەرەکان بزانم، مادام لیلیان دێت شانۆگەرییەکە زۆرباشە، ناکرێ، شانۆگەرییەکی ئاسایی بێت.. هەموو شتێ جوان دەبێ، لیلیان

له ناوەنـدیی هۆڵەکـە لـە تـاریکی و بێدەنگیـدا تیشـك دەداتـەوە. خـەڵکیش بـەم تیشـکە سەرسامن وهەموو شتێك جوانتروبەلەزەتردەبینن.

لـە هـەمان شـوێن چـاوەڕێم کـرد، لـە پـڕ.. لەبـەردەم تەقییـەوە. لیلیـانم لـە دوورەوە بینی. هەستم کرد هـەموو دەمارەکـانی لەشـم گـرژدەبن و پارچـە پارچـە دەبـن. جگەرەکـە بە دەستمەوە لەرزی. هەسـتم کـرد دڵـم زیـاد لێـدەدات و سـەرم سـوڕی خـوارد، باشـی بـۆ چـووبووم کـە ئـەوەم دانـا لیلیـان بێـت بـۆ شـانۆ و منـیش لـە شـانۆ دا دەیدۆزمـەوە، هەروەها لەوەشدا باشی بۆچووبوم، کە شەوی شەممە دێت.. ئەوەتا هات.

لەنێو تاریکییە کەمەکـەدا، لـە کۆتـایی شۆسـتەکەوە، تـا کۆتـایی باخچـەی شـانۆکە، بـەدوای هاتنـەوە بـووم کـە وەك کـەژاوەی شـاهانەوابوو. هـەنگاوی لەسـەرخۆ، قاپوتـە رەشـەکەی، کراسـەکەی کـە تـا ئێسـتا نـازانم رەنگـی چـی بـوو. لـەڕێی بەسـتەکراوەکەی قاپوتەکـەوە شـتێکی جـوانم دەدیـت بریسـکەی دەدا، لـە پـاڵ ئەوەشـدا دووقـاچ.. بـۆم دەرکەوت ئەو پیاوەی لەگەڵیدا بوو کەمی بەرەو دواوە دەکشیێ، مێردی بوو

" وەرە پێشـەوە ئـەی پەرسـتراو وەرە پێشـەوە و پـێ بنـێ بـە ئێسـقانەکانمدا. ئـەو سـاتەی پـێم پێـدا دەنێـی ئـەوە سـاتی لـە دایـك بوونمـە، سـاتی دەسـکردنمە ملـە لەگـەڵ جیهان و سروشت و هـەموو نهێنییـە پیرۆزەکـانی ئـەم کەونـە. دوودڵ مەبـە کـە پـێم پێـدا دەنێی، ئێسقانەکانم پێویسـتیان بـە قاچـی پـیرۆزت هەیـە تـا پـاك ببنـەوە، تـا بـەهێزبن و بە هێزترو بـەتواناتربن. وەرە پێشـەوە ئەگـەر نەتویسـت پـێم پێـدا بنێـی تکـات لێ دەکـەم بـە هـەموو زمانـەکانی زەوی تەماشـام بکـەی. لـە تەماشـاکردنێ زیـاترم نـاوێ.. تەماشـایەکی بچـووك, ئەگـەر تەماشـاش نەکـەی بەسمـە تێپـەڕی. بـۆنی عـەترەکـەت کـە بەلامـدا تێدەپـەڕی گـورزە تیشـکێکە هەمیشـە مـەزنترین سـەعاتەکانی سـەرکەوتن و خۆشیم وەبیر دەهێنێتەوە."

کەژاوە بچـووکەکەی نزیـك دەبێتـەوە، نـازانم چـۆن تەماشـای بکـەم، نـاوێرم بـیر لـەوە بکەمەوە، کە شایانی ئەم خۆشییە گەورەیەم.

کە نزیك بووەوە. کە تـەنها مـەودای سـێ مـەترمان لـە نێوانـدا مـابوو، دواجـار چـاوم هەڵبڕی، بۆ ئـەوەی تێـربم لـەم چـرکە سـاتە پـڕ خـۆش و ترسـە، لـە دەم و چـاویدا ژنێکـی دیکە بینی!

جگەرەکەم بە تووڕەییەوە فڕێ دا و پێم پێدانا، لە ناخمدا هاوارێك هەڵسا: لیلیان بەس نییە ئازار دانم؟ ئایا مانای چاوەڕوانی و داهێزران دەزانی کە ئەو مرۆڤەی چاوەڕێ دەکا هەست پێدەکا؟ ئایا قەت جارێ لە جاران بە پەرۆشییێکی شێتانەوە چاوەڕێت کردووە؟ بۆچی لیلیان؟ ئایا تۆش بوویت بە ژنێ وەك ژنەکانی دیکە؟ ئایا وا هەست دەکەیت کە شێوازێکی وەك ئەمە دەتوانی خۆشەویستییەك بخولقێنی لە خۆشەویستی من شێتانەتربێ بۆ تۆ؟

کە بوو بەهەشت و نیو و نەهات، پێنج دەقیقەی تر چاوەڕێم کرد، پاشان بلیتەکانم دڕاند و جنێویشم بە هەموو شتێ دەدا لەم جیهانەدا!

ئایا لیلیان حەزی بە شانۆی جدی نییە؟ تۆ بڵێیت بچێت بۆ شانۆی پێکەنین؟ بەڵام ئەوان لەوێ بە زمانی پیس قسەدەکەن، نەك هەر قسەیان بەڵکو هەندێ جوڵەشیان پڕە لە پیسی وورووژاندنی نزم و خراپ. ناکرێ لیلیان بچێ بۆ ئەوێ. کەواتە چی ماوە لەسەرم بیکەم؟

کە چوم بۆ ماڵی میرا دایکی هاواری کرد بە رووما و بە گلەییەکی توندەوە.

-نابێ وا لە خۆت بکەیت، بەمجۆرە بمریت، تۆ رەنگت زەردە و لێوەکانت شینن. هەستم نەدەکرد کە نەخۆشم، تەنانەت کە دایکی میرا دەستی خستە سەرناوچەوانم تا بزانێ گەرمە یان نەء. هەستی بە گەرمایی نەکرد، بەڵام سەرسوڕمانەکەی هەرما. لێی پرسیم برسیم، نەخۆشم، کە گوتم نەء. بە شێوازی دایکانە گوتی:

دەبێ بچی بۆ دکتۆر وەزعی تۆم بە دڵ نییە.

میرا لەماڵ نەبوو. سەعات نۆو نیوی تێپەڕاند، بەڵام ئەمە شەوی شەممەیە. دەکرێ لە میرا ببوورم وەك لە لیلیان بووڕام، جا ئەگەر لێشیان نەبورێم چیم پێ دەکرێ؟ دەبێ لەسەر هەموو شتێ رابێم، لەوەش زیاتر دەبێ خۆم ئامادەبکەم بۆ رۆژی سەختەکانی داهاتوو.

خەریکی خواردنی پارچە گۆشتێك بووم لەگەڵ قومی بچووك بچووکی شەراب، کە دایکی میرا لێی پرسیم:

- بۆچی وەك جاران ناتبینین؟ هیچ بووە لەنێوان تۆ و میرادا؟

- هیچ شتێ نەبووە.. بەڵام خوێندن، تۆ دەزانی ئەگەر ئێستا تەواوی نەکەم، دەبێ تاسەرەتای ساڵی تازە چاوەڕێ بم.. منیش نامەوێ چاوەڕێ بکەم!

- میرا لەگەڵت نەبوو؟
- نەء بۆ وتی لەگەڵمایە؟
- نەیگوت و منیشی نەمپرسی، بەڵام وامزانی بەیەکەوەن.
- لـە ژوورەکـەی خۆمـدا بـووم و خـەریکی خوێنـدن بـووم، لەبیرچـوو کـە ئـەمڕۆ شەممەیە تا درەنگ ئەوەتا هاتم!
- دواناکەوێ.. هەردێت.
- سـەعات یـانزە مـاڵی مـیرام بەجێهێشـت. مـیرا نـەهاتبووەوە. مـاوەی نێـوان مـاڵی ئـەوان و ژوورەکـەی خـۆم بـەپێ بـڕیم. ماوەکـە زۆر بـوو. قـەتیش بـیرم لـەوە نـەدەکردەوە کـە بەتـەنیا و بـەپێ بیـبڕم، ئەگـەر ئـەم گشـتە خـەم و نائومێدییـەم لـە دەروونمدا نەبایە.

لەرێگـە بـیرم لـە شـارە گـەورەکان و خۆشەویسـتی و لیلیـان کـردەوە. بـەغیلیم بـە ئیڤان و رادمیلا برد و هەستم کـرد ژیـانم دەبـێ بگـۆڕێ. ئـەو شـەوە کـە خـۆم لـە سـەرما دەپاراست زۆر بڕیارم دا.

ئەگەر لیلیان لـە دەرگاکـەم نـەدا ناچـم بـۆ هـیچ شـوێنی بەدوایـدا بگـەڕێم! زۆر ناچـار نـەبم لـە ژوورەکـەم ناچـمە دەرەوە. لەمـەودوا لەبـەردەم وێسـتگەی ترامـدا وەك سـواڵکەر راناوەسـتم. ئەگـەر بشچـم بـۆ شـانۆ بەتـەنیا ناچـم، لـە چـایخانە، لـە سـینەما، لـە هـەر شـوێنێ بەچـاوی گەمـژەیی تەماشـای دەم و چـاوی خەڵکەکـە ناکـەم، بەتایبـەتی دەم و چاوی ژنان تاکو بگەڕێم بەدوای ژنێکدا کە بە گوێرەی من مرد.

بڕیارم دا چـیتر بەدوایـدا نەگـەڕێم، بـەخۆمم گـوت، ئەگـەر بەرێکـەوت لـە شـوێنێکدا بینیم ئەوسا بە گەرمەوە مەرحەبای دەکـەم، بـەڵام بـێ ئـەوەی خـۆم سـووك بکـەم، ئەگـەر یەکتریشـمان بینـی ئـەوا وەکـو دوو کـەس جـارێ لـە جـاران یـەکتریان دیـوە، لـە شـوێنێ پاشـان، لەیـەك جیابوونەتـەوەو یـادەوری ئـەو یـەکتر بینینـە بـەلای هەردووکیانـەوە ئـازیز دەبـێ و هیچـی دیکـە لـەم زیـاتر نـابێ. بـەڵام ئەگـەر بینـیم لەگـەڵ مێردەکـەی ئەوسـا سەریان بۆ دەلەقێنم بێ ئەوەی سەرنجی ئەو راکێشم یان بشڵەژێم.

لیلیـان منـی نـاوی، ئەگـەر نـا هـەر چۆنی بوایـە یـەکترمان دەدی، ئێسـتا کراسـێك ئەدورێ یان لەسەر جێگـەی منـداڵێك لـە منداڵـەکانی وەسـتاوە گـۆرانیی بـۆ دەڵـێ تـاکو بخەوێ. ئەگەر لـە هـەموو شـتێ بـووەوە چوارگۆشـە بەتاڵـەکانی چـاوەڕێی دەکـەن. لیلیـان

ژنێکـه بـۆ غـەیری مـن خولقـاوە و پێویسـت ناکـا بیدۆزمـەوە و لـە جیهـانی خـۆی دەریبکەم. ئەگەر بشمەوێ وا بکەم بۆم ناکرێ!

بەڵام دەبێ ئێستا چی بکا؟ چی دەکا؟

ئـەم پرسـیارە ماوەیـەکی زۆر لـە مێشـکمدا مایـەوە، هـەموو کـاتێ وام دادەنـا کـە شتێك دەکا: لە پەنجەرەوە تەماشا دەکا، کراسێ دەدورێ منداڵێ دەخەوێنێ.

پێدەکەنێ... بەڵام لـە هـەموو ئەمانـە زیـاتر ئـەوە بـوو، کـە دەبیـنم دەگـری.. نـازانم بۆ بەو جۆرە بـیرم لێ دەکـردەوە، چـونکە قـەت جـارێ لـە جـاران نەمـدیبوو بگـری، بـەڵام هەمیشـە فرمێسـکی قەتیسـم لـە چـاویدا دەدی. نەدێتـە خـوارەوە نـەلاش دەچـێ، کـە ئاواش دەهاتە بەرچاوم : خەمبار، هەستم بە بێ ئومێدی کرد و خەریکە بمخنکێنێ.

*** 

ماوەیەکی زۆر تێپەڕی.

لیلیـان لـە یادەوەریمـدا وەك پەیکـەر بڵنـدە، بەشـەوو بـە رۆژ دەیبیـنم، زۆرجـار دڵـم داخورپاوە کـە ژنـانم دیـوە لـە لیلیانیـان کـردووە. زۆر جـار دوای ژنـان کـەوتووم، سـواری زیـاد لـە ترامێـك بـووم، زۆر وەترسـتام لـە وێسـتگەکانی سـەرەتاو کۆتـایی. هـەروەها وێستگە دوورە لاچەپەکان. زیـاد لـە جارێـك چـووم بـۆ شـانۆ و رۆژانـی شـەممەش دەچـووم. نـەمتوانی واز لـە گـەڕان بێـنم، بـەڵام دەرچـوونم لـەم ماوەیـەدا وەك جـاران نـەمابوو.. چونکە دڵم پڕ بوو لە خەم و بێ ئومێدی.

لـەم ماوەیـەدا بڕیـارم دا خوێندنەکـەم بـە زووتـرین کـات تـەواو بکـەم. برادەرایەتیەکەشـم لەگـەڵ مـیرا بپـارێزم. زۆر ناکۆکیمـان نـەبوو. کـە بەیەکـەوە قسـەمان دەکرد بۆ مـیرام روون کـردەوە ئـەو ماوەیـەی ماومـە کورتـە تـا رادەیـەك، بۆیـە پێویسـت بە ناکۆکی ناکا، پێم گوت یـادەوەری گەشـاوەی خۆشـی باشـترین شـتە بـۆ ئـەوەی کۆتـایی بەپەیوەندییـەکانمان بهێـنین، تـووڕەیی، خراپـی، ئـەوە یادگـارییێکی تاڵـە بـۆ هـیچ کامـانم ناوێ. پاشان بە پەیوەندیی ئەو لەگەڵ میلان دەزانم و نامەوێ هیچی لێ بگۆڕێ.

میرا ئەمانـەی قبـووڵ کـرد و پێـی رازی بـوو، خـۆی دایـە دەسـتم بـە جۆرێـك زۆر لـە ئازارمی کەم کردەوە.

پـاولام سـێ جـار یـان چـوار جـار بینـی. زیـاتر قەڵـەو بووبـوو و دەگەشـایەوە و ئارەزووی ژیانی زیاتر بوو لە جاران. هەرچـەندە جـارێ لـە یانـە بینم،دوویـان سـێ جـار لـە

چایخانەیەکدا. ئەم دیدارانە بە جۆرێکی ناسك کۆتاییان هات و هیچ (ازعاج) م دەکرد بە هیچ جۆرێ، دوایین جار کە ماچم کردو دەستم بۆ سنگی برد، بۆ ئەوەی بۆ ئەم ماچە مانایێکی تایبەتی دروست بکەم وەك خوا حافیزی.. هیچی نەکرد. لێوی دامێ... هەستم کرد کە ماچی دەکەم ئەوە جوانترین ماچ بوو کە پاولا بە منی دایێ!

ئیڤان و رادمیلا... لەم رۆژانەی دواییدا دەمویست لە هەموو کەس ببوورم، بۆیە لەگەڵ ئەو دوانەدا زۆر بە ئەدەب و نەرمییەوە رەفتارم کرد.. دووجار دەعوەتم کردن، جارێ بۆ شانۆ و جارێکیش بۆنانی شەو لە چێشتخانەیەکی زۆر نایابدا، لە هەردوو جارەکەشدا دوو بوتڵ شەمپانیام لە تەندروستی بووك و زاوا کردەوە.

کە خوا حافیزیم لە ئیڤان کرد لە دوا گەشتیدا بۆ گوند پێش ژن هێنان، زۆر نەرم و بڕوای بە خۆی بوو. هیچ جۆرە گومانێك یان ترسێکی پێوە دیارنەبوو پێش چەند سانییەیەکیش ماچێکی دوورودرێژی لێوەکانی رادمیلای کرد.

رۆژانی هاوین کۆتاییان هات، خوێندنمان تەواو، هەموو شتێ کەوتە ئارەزووی چاوەڕوانییەوە ژوورەکەم جێ هێشت ئەوراقەکانم هەڵگرت، کامیراو هەندێ لە کتێبەکانم دایە چەند برادەرێ، بۆ میرا ئەو سێ تابلۆیەم بەجێهێشت، کە دیواری ژوورەکەمیان دەڕازاندەوە. ئەویش بە دڵی بوون. هەروەها دوو دیوانە شیعریشم بۆ کڕی، یەکێکیان هی رامبۆ بوو ئەوی دیکەشیان هی بۆدلێر. لەسەر دیوانەکەی بۆ دلێر نووسیم:

((بۆ میرای خۆشەویست:

بۆدلێر شیعر فێری کەس ناکا مەگەر ئەوانەی ئازاریان هەیە و دڵتەنگن.. تۆ.. دەمەوێ هەر لە خۆشیدا بی زیاتر لەوەی دەمەوێ شاعیر بی.))

پاشان بۆ دایکە (دایکی میرامان وا بانگ دەکرد) شاڵێکی خوریی سپیم بۆ کڕێ. ئەو رۆژەی ماڵەکەم جێهێشت ماچم کرد.. ماچێك نازانم بۆ وا گەرم بەپەرۆش بوو.. بۆ خۆشی بە کوڵ گریا، ئەوەندە گریا نەمتوانی بەرگەی بگرم.. دوای ئەوەی لە قالدرمەکەمەکان دابەزیم، ئەو لە باڵکۆنی پێشەوە وەستابوو هاواری کرد وبە پەنجەش هەڕەشەی لێدەکردم.

دەبێ هاوینی داهاتوو بێ ، لەبەر من، نەك لەبەر میرا،

لــه دوارِۆژمــدا پــێش ســەفەر لــە هــەموو پەیوەندییــەك وازم هێنــا و هــەمووم دا بــە لیلیان.

بــە شــارە گــەورە نەفرەتییەکــەدا گــەڕام، چــووم بــۆ هــەموو شــوێنێ، ســەردانی مۆزەخانە بچووکەکەم کـرد، لـە کۆتـایی هێڵـی ترامـی ژمـارە (٥) بـە ئومێـدی لـەوێ ی ببیـنم، چـوومە باخچـەکەی گونـد، بـازاڕی سـەوزە، لـە گەڕەکـە دوورەکانـدا سـووڕامەوە، تەماشــای هــەموو پەنجەرەیــەکم کــرد، دیقــەتی دەم و چــاوی ژنــانم دا، دەم و چــاوی منــداڵان، بەشــکو دەمــو چـاوی ئــەو ببیــنم، یــان هــی منداڵــەکانی بــەڵام ئێــوارە کــە گەڕامەوە ناوەندی شار زۆر بێزار بووم لە هەموو شتێ!

دواشــەو لای بــرادەرێ خــەوتم. هــەوڵم دا باســی دڵــداری و یادگــاری بکــەم. ویســتم قســەبکا، بەشــکو چــیرۆکێکی هــەبێ وەك ئــەوەی مــن. هەرچــەندە زۆر داوای لێکــردم شتێکی تایبەت بڵێم، یەك وشەم لەبارەی لیلیان نەگوت.

ئــەو شــەوە نووســتم و خــەیاڵی وەك باڵندەیــەکی رەنگــاو ڕەنــگ بــە دەورمــدا دەســووڕایەوە. هــەزاران جــار خــەونم پێــوە دیــت. پــێ دەکــەنێ جــل دەدورێ، منــداڵ دەخەوێنێ.. بەڵام روونترین خەون کە پێوەیم دی، ئەوە بوو.. کە دەگریا.

دەبایە بەیانی دوایی لە سەعات دەو نیو سەفەر بکەم.

## سەفەر:

....زوو لــە خــەو هەڵســام، شــار هێشــتا لــە خەودایــە، روونــاکی یەکــەمی بەرەبــەیان تێکەڵ بە دووکەڵ و تەمە.

شانم دادایــە ســەرلێواری پەنجەرەکــە، بــۆ ئــەوەی خواحــافیزی لــە هــەموو شــتێکی ئــەم شــارە بکــەم، رەنگــە بــۆ دواجــاریش بــێ. ســێبەرەکەکان کــە بەپەلــە دەڕۆیشــت وەك (تارمایی)دەهاتنـــە بەرچـــاو. شـــیرفرۆش، رۆژنامـــە پـــەخش کـــەر، منـــداڵێك نـــانی هــەڵگرتووە، دوو پــیرەژن هێــدی و لەســەرخۆ دەڕۆن بــەیناو بــەینیش دەوەســتن و دووچــپە دەکەن.. پاشان دووبارە دەس بەڕۆیشتن دەکەنەوە.

بەخۆمم گوت: ئـەم شـارە دەناسـم و نایناسـم، ئەمـە ئـەو شـارە نییـە کـە مـن پێـنج ساڵ تیایدا ژیام.

مـرۆڤ... پێکەنینـەکان، ڕێژنـە بـاران، بـا، پاشـان بـەفر. خۆپێشـاندانی قوتابیـان، گۆڕەپانـە پانـەکانی جادەکـان.. پەیکـەرەکان.. دارسـتانی منداڵـەکان کـە پێدەکـەنن.. لیلیان .

ئایا ئەمە شارەکەی منە؟

هەموو شـتێکم لـە بـیرە.. لـەبیرم نییـە. لەبەردەممـدا پێـنج سـاڵەکە دەکشـێ. هـەموو بێـزاری و ڕۆژە خۆشـەکانی بـێ هـودەیی و شـێتییە پـڕ هەراکـەی سـاتە جـوان و پرشندارەکان تێدەپەڕن:

"ئیڤـان.. ئیڤـان دەمـەوێ پرسـیارێکت لێ بکـەم و دەبـێ راسـتیم پـێ بڵێیـت.. ئایـا خوا هەیە یان نییە؟ "

کرامـا زۆفـی بـاوك پەرداخـە شـەرابەکە دەخواتـەوە، بەچـاوێك کـە چـاوەڕوانی دەکـا گوێ لـە وشـەکانی ئیڤـان دەگرێـت، کـە وەڵامـی دەداتـەوە هۆڵەکـە هـەر هـەموو چـەپڵە لێدەدەن (دەڵێ خـوا نییـە)، کۆتـاییش دەگاتـە ئاسـتی مـرۆ خـەونی پێـوە نـابینێ. ئیڤـان شێت بووە یان خەریکە شێت دەبێ.

گێلەکـە و هاملێـت، گـوڵ فرۆشـە ئیسـپانییەکە، ژێـر زەمینـە بچـکۆلە تاریکەکـەو مۆسـیقای قـەرەج، ژێـر زەمینـە گەورەکـە، دوو خواوەنـدە خەمبارەکـە وەك دوو کـۆتر بەرانبـەر یـەك دەخـوێنن، کـە ئـەو گۆرانییـە خەمۆکیانـە دەچـریکێنن. ژنییەکـە خـۆی دەپچڕێنێ پاشان چاکی دەکاتەوەو دەست بە مۆسیقا ژەنین دەکاتەوە.

ڕۆژانـی بـەهار.. گەشـتەکان، دەس لـەملان سـەرخۆش و خـەوتن لـە وێسـتگەی شەمەندەفەرەکاندا.. شەهوەت لە چاوەکاندا.

ئایـا ئەمـە هـەمان شـارە؟ ئایـا زسـتان و هـاوین لەیـەك سـەرباندایێك دەگـەن؟ ئایـا دەکرێ مرۆڤ بێزار و دڵخۆش بێ لە هەمان کاتدا؟

بـەردی ماڵـەکان کـە مـن ئێسـتا تەماشـایان دەکـەم، لـەم پەنجەرەیـەوە بێگومـان بـۆ دواجـاریش لـەم پەنجەرەیـەوە، بـەردەکان پیسـن و دووکـەڵ و ڕۆژگـار و دارو درەخـت بـە گـەڵا گـەورە خوڵاوییەکەیەکـەوە.. چـاوەڕێی بـارانێکی هاوینـە دەکـا وەك ئـەو بارانـەی تاکو خۆڵ و تۆزی لێ بکاتەوە وی بیشوا.

شۆستە تەسکەکە، بەریکییە بۆرە بێزارکەرەکەی، درێژ دەڕوا.. پاشان لای بەردێ کە ئەملاو ئەولای شکاوە دەوەستێ. دوایی دووبارە دەس پێ دەکاتەوە تا دەگاتە گۆڕەپانەکەو بەدەوریا دەسووڕێتەوە..

ئەمسەرو ئەوسەری پەنجەرەکە بەتەنەکە زەنکی ژەنگاوی داپۆشراوە. پەردەکانی باڵەخانەکەی بەرانبەر، دووکەڵکێش،لەسەر ئەو پەنجەرەیەی کە بەرانبەر پەنجەرەکەی من.. ئێستا.. حەوزی چاندنی بچووك هەیە.

ئەو شارە دەناسم و نایناسم.. ساڵانی یەکەم و دوا ساڵ. کۆمەڵە جیهانێکی تێکچڕژاو بوو، هەوەسی بەرەڵڵا پاشان پاشەکشە. پشیلە لە پێچ و پەنای ژێرزەمینەکاندا یان لە باوەشی ژنە ماندووەکاندا، بانگەوازە ناوخۆییەکان کە پڕە لەویستی دەس کردنە ملی بەرائەت و پاکژی ئەو شتانەی ئەو ژنانە گاڵتەیان کە قەت تەماشا ناکەن.

چوار ساڵ.. پێنج ساڵ.. بۆ خاتری یەك تەماشاکردنی لیلیان.. هەزاران ساڵە چاوەڕێم دەکردی.. کە دەستم بە نائومێدی درێژکرد.. نەما. لە دەروونمدا خەمێکی بەجێهێشت کە کۆتایی نایێ.

بیر دەکەمەوە، خەون دەبینم، رەنگە بەهۆی دەنگە بەرزەکانی وڕێنە ناخییەکانم هەڵدەستم، شانم دادەدەمە سەرجێگەکە و ئەویش تەماشام دەکا، هەستم کرد چاوەکانی پشتم دەسووتێنێ، کە ئاوڕم دایەوە بە رامانێکی لاڵ تەماشای دەکردم، وەك ببینێ و نەمبینێ، لەپڕ بە ئاگاهاتەوەو پرسیاری لێکردم.

- لەکەیەکەوە بە خەبەری ؟
- پێش کەمێ.
- چی دەکەی ؟
- چاودێری شار دەکەم!
- بۆ ئەوەی بیناسی؟
- بۆ ئەوەی لەبیری نەکەم!
- ئەی هیچت دۆزییەوە؟
- نامەوێ هیچ بدۆزمەوە. دەمەوێ دڵنیابم.
- لەچی؟

- که هەمان شارەکەمن دەیناسم و تیایدا ژیام.
- هەمان شارە: تەلارەکان، جادەکان، تەنانەت دووکەڵکێشەکانیش هەر هەمان شتن و نەگۆڕاون!
- شار مرۆڤە.. پەیوەندی لەنێوان مرۆڤدا !
- قسەیەکە هەزار جار گوتوتە.
- بەڵام هەر بە تازەیی دەمێنێتەوە، هەرواش دەمێنێتەوە؟
- چی ڕوودەدا لەم دواساتانەی دەتەوێ ئەم شارە بەجێ بهێڵی؟
- هیچ... هیچ!

هەڵسا چوو بۆ حەمام... منیش لە جێی خۆم مامەوە.

شار... مرۆڤ... چ شارێك و چ مرۆڤێك؟ چەند جەرگبڕە مرۆڤ یادبکاتەوە!

ڕۆژی یەکەم: بای زستانە لە دەم و چاو و شەمەندەفەرەکان دەدا. خۆم بەتەنیا لەسەر شۆستەی وێستگەکەو بە دوو جانتاوە. نازانم چی ئەکەم لە شارێکدا کە بۆ یەکەمجارە دەیبینم.. حەماڵی لێم نزیك دەبێتەوە، زۆری وەکو منی لەسەر ئەم شۆستەیە دیوە. هەڵم دەگرێ، دوای ئەکەوم وەك پشیلە سەرئەکەومە سەرەوە. کە جانتاکانی لەبەردەم دەرگای ئۆتێلەکەدا فڕێ دا، نیوەی ئەوەی هەمبوو لێی سەندم.

ڕۆژانی یەکشەممە لە جادەکاندا بزردەبم. بەدوای پارویێکدا دەگەڕێم و تەماشای دەم و چاو و شۆستەو دارەکان دەکەم. تاکو خۆم دەکەم بەناو بارێکدا، کە کەشتیوانەکانی رووبار و بەدبەختەکانی لێیە.. لەوێ ئەوان چی دەخۆن، منیش ئەوە دەخۆم پاشان دەخۆمەوە، دوای نیوەشەو و سەرخۆش و ون بوون لێ دەکەوم تا عەسری ڕۆژی دوایی دەخەوم!

ئەوە یەکەم ڕۆژ بوو.. ڕۆژانی تریش هەروابوون.لەڕۆژانی دواتر.. دنیا رووناك دەبێتەوە، سەری ساڵ یانەی قوتابییە بیانییەکان، دەمو چاوە سەرسوڕماوەکان و ترسیش لە ئێسقانەکان دەچەقێ. لەیەکەم ساتەکانی ساڵی نوێدا چاوە سوور هەڵگەڕاوەکان دەکەونە شەڕی ئەوەی کێ ئەو کچە قەڵەوەی دەس دەکەوێ. کە بۆ هەموان زەردەخەنەی کردو لەسەر مێزی هەموان دانیشت.. دوای سەعاتێ لە رووبەڕووبوونەوە، کچە قەڵەوەکە دەچێتە دەرەوە و باڵی کردووە بە باڵی برادەرێکیدا، کە چاوان نەیاندیتبوو، دەڕوا.

سەری ساڵی دووەم: شێوەکان.. پەیوەندییەکان.. جیهان.. هەموو شتێ دەگۆڕێ.. کە تیپی مۆسیقاکە سەرەتای سەری ساڵی نوێی راگەیاند، هەموو مۆمەکان کوژێنرانەوە جگە لە دوو مۆم، کە وەکو هێمایەك بۆ رووبەڕووبوونەوەیەکی گەمژانە مابوونەوە.. مۆمەکەی من و مۆمی رەفیقەکەم بوون.. دوای ئەوەی سەرنەکەوتین دوو کچ رازی بکەین ئەو شەوە لەگەڵمان بن!

ئەوەندە سووراینەوە بە دەوریا لە رۆژگارماندووبووین، لەشی پیاو و عەقڵی منداڵ.. شەهوەتی سەگ و کەڵەشێرو خەساندن! هەموو ئەو خەمانەی لە دوورەوە بۆمان دێ، هەڵمان گرتن.. خەونەکانیشمان تۆفانێك بوو کۆتایی نەبوو!

هاوینان و لێکردنەوەی (الکرز).. میرا کە دەیەوێ ئەم هونەرمەندە چەناگە خوارە. بدۆزێتەوە.. سەردەکەوین و هەناسە بڕکێمان پێ دەکەوێ.. دەخوێنینەوە لەسەرگیا سەوزەکە رادەکشێین. وشەی شیعرەکانیش کە میرا لەو کتێبەی هەڵی گرتووە دەریان دێنێ و بلاویان دەکاتەوە بە دەورمانا دەسووڕانەوە.

میرا بە خێزانی شار پێش دەکەوت و دەگەڕایەوە.. زۆری پێ خۆش بوو.. زۆرجاریش لەناو جێگا نامۆ بوین بەیەك!

قوتابیان لەهەموو جیهانەوە.. خەون و پەیمان، سیاسی، شەڕی بێ کۆتایی.. هاوین و سەربازگەکانی لاوان و بەچاوی سووك تەماشاکردنی وەرزش و خولیاکان.. چاوەڕوانی شتێ کە نایێ، پاشان بە حەسرەتەوە دووبارە چاوەڕێ بکەوە!

ئەمەیە ئەو شارەی من دەیناسم؟

شار لە جێی خۆیەتی، قایم و بەهێزو رۆژانە پێشوازی لە هەزاران کەس دەکاو خواحافیزی لە هەزارانیش دەکا. خەڵکی لە ژێر ئەم پەردەوە تێدەپەڕن، کە ناویان ناوە. ژیان. لەمبەر بۆ ئەوبەر و پەردەکەش هەرماوە بە چاوێکی بێ لایەنانەی توند سەیری هەموو کەس دەکا، خەڵکەکە بۆ خۆیان لەژێر پەردەکە رادەوەستن.. رادەوەستن و تەماشادەکەن، خەون دەبینن، دەستی یەکتر دەگوشن. وشەی خۆشی دەڵێن.. وشەی خەمۆکی پاشان بەردەوام دەبن لە گەشتەکەیاندا.

خەڵك شارەکانن! چوار ساڵ.. ساڵی پێنجەم.. هەموو قوربانی ساتێك چاوەکانتی تێدا ببینم لیلیان!

ترسنۆکی لە خۆبایی بوون، راکردنی شێتانە لە کۆتاییدا چاوەڕوانی بێهودەی مرۆڤێك کە نایێ!

لیلیان تۆ لە کوێیت؟ هیچ وشەیەك کەڵکی دەبێ ئەگەر ئێستا بەبادا بۆتی بنێرم؟ ئەگەر قەناعەتم هەبوو کە ئەو بایەی ئێستا تێدەپەڕی بایەکی دۆستە.. دۆستە تاڕادەیەك، دوا وشەکانی خۆمم پێ گوت پێش ئەوەی شار بەجێهبێڵم. بەڵام با گوێچکەیەکی کەڕە، پردێکی دیکەی بێ لایەنە، مانای ئازاری مرۆڤ نازانێ.. بە گاڵتەجاڕیشەوە تەماشادەکا.

دوا وشەکانم بەکێ بڵێم کە تۆ بەجۆرە لێم دووربی لیلیان؟

کە هەواڵی ئەو ژنە خۆرەم- المراه الشمش- لە رادمیلا پرسی ئیڤان گاڵتەی پێم دەهات، تەماشاکردنەکەی پڕبوو لە پێکەنینی بێدەنگ، پێکەنینە بێدەنگەکەی ئێشی پێ گەیاندم.. رادمیلاش نەدەهاتەوە یادی.. ئەگەر لە دارەکانی شاخەکەم بپرسیبایە، یان لە دەریاچەکە یان ئەو بەلەمەی جارێکیان بینیم سواری بوو، ئەوانیش وەك ئیڤان گاڵتەیان پێ دەکردم.. لەوانەیە زیاتریش.

بێ سوودە ئێستا هەرچییەك بڵێم.. هەموو شتێ کۆتایی هات!

کە دەستی برد بۆ شانم داچڵەکیم، هەنگاوێکی بچووك بەرەو دواوە پاشەکشەی کرد و داوای لێ بووردنی کردو گوتی: -ئەگەر ویستت هەزاران کارتت بۆ دەنێرم. هەر کارتێ وێنەی شوێنێکی ئەم شارە نەفرەتییەی لێیە.. هەر ئەوەندە تەماشای وێنەکانت کرد.. هەموو شتێکت دێتەوە بیر!

شتێکی باشە لەبیرت نەچێ بیکەی!

-بەڕێز شار هەر لە جێی خۆیەتی، گەلێك جاران دەگەڕێتەوە ئێرە، ئەوەی لە ئاوی ئەم شارە بخواتەوە هەر دێتەوە بۆلای!

کە تەماشای کرد وەڵام نادەمەوە گوتی :

- ئەڵێی چی ئەگەر ئێستە واز لە سەفەر..بێنی؟ دەتوانی دوای هەفتەیێ یان دوان سەفەر بکەی.

- دەتەوێ لەم ماوەیەدا چی بکەم؟

- وێنەکانی شار دەهێنێتەوە یاد.. دڵی ژنەکانی خۆش دەکەی!

- تۆ بۆچوونت خراپە و دەتەوێ (استفزاز) م بکەی!

- دەبێ پێش ئەوەی ببزوێین شتێ بخوێن، پاشان دەچم سفتیلانا بانگ دەکەم چونکە حەز ئەکا خوا حافیزیت لێ بکا!

- شار گەورە دەبێ، فراوان دەبێ، پڕ دەبێ لە ترومبێل و پیاو و ژن دووکەڵی بەیانیان لە بەرتیشکی خۆردا خۆی بۆ راناگیرێ .پەنجەرەکان دەکرێنەوە و نوێنەکان فڕێ دەدرێن. دەمو چاوەکان سپی هەڵگەڕاو وکاریگەریی خەوی بەسەرەوە دەمێنێ. داری رێگاکان سەوزاییەکانیان دەگەشێتەوە. بەردە شکاوەکانی شۆشتەکان چیتر دیار نامێنن لەناو ئەو قەرەباڵغەدا.

شار ئێستا ئەو شارەی پێش سەعاتێك نییە هەروەها ئەوەش نابێ لە کاتی خۆراوا یان لە نیوەشەودا. شار هەموو سەعاتێ خۆی تازە دەکاتەوە، دەگۆڕێ، چی لە شاردا دەگۆڕێ؟ بەردەکان لە جێی خۆیاندا بەهێزن و نابزوێن، دارەکان لەسەر لێواری شۆستەکان پێشوازی لە خۆر دەکەن و خواحافیزیی لێ دەکەن لە جێ خۆشیەتی و ناگۆڕێ. پەیکەرەکان، باخچەکان و پەنجەرەکان تەنها شتێ لەم شارەدا دەگۆڕێ. لە هەموو شارێکیشدا خەڵکەکەیەتی، دڵخۆش دەبن، خەمبار دەبن، شەوان بەبێ دەنگ دەگرین. پێدەکەنن. لەگەڵ ژنان دەخەون و پەشیمان دەبنەوە.. چاوەڕوانی و ئومێد... ئەو دەستانەی لەترسا لێك دەئاڵێن.. لە دواییشدا شتێ هەیە پێی دەڵێن پەرۆشی.. خۆشەویستی.. و لیلیان.

پەشیمان نابم.. دوێنێ ئەم بڕیارەم دا. بە خۆمم گوت لەبەیانییەوە دەبێ ژیانێکی نوێ دەس پێ بکەم..

ئەو بەیانییەی سوێندم خوارد بیپارێزم، بیبەخشمە ژیانی نوێ، ئەو شارەی ئێستا خوا حافیزیی لێ دەکەم لێی دزیم. لەگەڵ هەڵهاتنی خۆردا لێی دزیم. ئەو بیرۆکانەش کە بڕیارم دابوو خۆمی پێوە سەرقاڵ بکەم، ئێستا بە جێیان دێڵم بۆ ئەوەی لە تەمی بەیانی شارێکی بە ئازارو جواندا مەلە بکات!

کە لە پەنجەرەکە دوورکەوتمەوە بە چپە بە خۆمم گوت بۆ ئەوەی کەس نەیبیستێ: لەبەیانییەوە دەس پێ دەکەم.. دەبێ ئەم رۆژەش بۆ یادگار بمێنێتەوە.. بۆ ئەو ساڵانەی لێرەدا بردمە سەر.

***

وێستگەکە کە ئەمجارەیان چوومە ناوێ بە خەمەوە پێدەکەنی. دووکەڵی شەمەندەفەرەکان لە خۆرەتاوی هاویندا پەرتدەبوو، لەو دووکەڵەش ناچێ کە یەکەمجار بەردەم و چاوم کەوت.. ئەو دووکەڵە چڕ بوو، قورس بوو نەدەجوولا.. کەچی ئێستا دەتوێتەوەو لەنێو خەڵکدا دەفڕێ.. خەڵکەکەش ئێستا ڕادەکەن بەدەیان وە ژووردەکەون و دێنە دەرەوە... بەسەدان.. تابلۆ گەورەکە دەخوێننەوە پاشان رادەکەن.. جانتاکانیان بە دەستیانەوەیە یان لەسەر عەرەبانەیە لە دواوە یان لە پێشەوەیان. ئەو دەم و چاوانەی ئێستا دەیانبینم گەشاوەو بەختیارن. وێستگەکەش لەبەردەم تیشکی خۆردا هەڵدەپەڕێ،وەك بڵێیت خۆی بشوا!

وەك لە هەموو گەشتیارێ روودەدا، خۆم لەناو کۆمەڵێ برادەردا دۆزییەوە، ویستم خۆم وا پیشان بدەم، کە خۆڕاگرو دەمارتوندم. زەردەخەنەیەکی بچووك و هێمنم لەسەر لێوم نەخشاندو بڕیارم دا هەموو یەکێ زەردەخەنەیەکی یادگار و وشەیەکی خواحافیزیی پێ ببەخشم.

میرا رەنگی زەرد بوو و چاوی لێم نەدەترووکاند، بەڵام رادمیلا تەواو رازی بوو: زەردەخەنەیەکی شیرین، وشەی ئازا لێرەو لەوێ بێ دوودڵی بڵاویاندەکاتەوە، وەك بڵێیت لە هیچ شتێ و لە هیچ کەسێ ناترسێ.. برادەرە پیاوەکان.. لەگەڵ هەندێ دۆستی ژندا خۆیان واپیشان دەدەم کە خەریکی خۆشن، لە کاتێکدا ئەم هەموو خۆشییەیەی و قاقا پێکەنینەی پێویست نەبێ... کە لەو ئەڵقە بچووکەدا دەنگ دەداتەوە.

بۆ ئەوەی کەش و هەوایەکی پێکەوە گونجان بخوڵقێنم بە میرام گوت:

- دەبێ هاوینی داهاتوو بێیت... چاوەڕێت دەکەم.
- کەمێ بێدەنگ بووم پاشان گوتم:
- گرنگ نییە هەر خۆت بوویت بە تەنیا.. یان کەسێکت لەگەڵ بوو!

میرا ویستی پێ بکەنێ، نەیتوانی، پێش ئەوەی هەلەکە لە کیس رادمیلا بچێ گوتی:

- باشتر وایە تۆ بێیت.. میرا ناتوانی بەتەنیا بێت، هاتنیشت بۆ ئێرە لە پێناو هەموانە، نەك هەر میرا بەتەنها.

برادەرێ وتی :

- ئەوانە کێن... پیاون یان ژن؟
- ئەوانە ئەوانەن... تۆش دەزانی؟
میرا پێکەنی... بەڵام رادمیلا نزیك بووەوە و تەماشای کردم وەك تۆمەتباریێ!
برادەرێکی دیکە گوتی وەك بەردەوام بوون لەو هێرشە بچووکەی دەستی پێکرد!
ئەگەر ئەوانی دیکە ژن بن باشتر وایە نەبێت.. میرا دەتوانیێ بچێتە ئەویێ!
وەك منداڵیێ هاوارم کرد.. ویستم رێڕەوی هێرشەکە بگوڕم:
- میرا.. دەیانەویێ هانت دەن.. تۆ دەزانی من چۆن مرۆڤێکم!
میرا سەری لەقاندو زەردەخەنە زەردەکەش دوا چەکییەتی لەبەرگری کردن.
رادمیلا گوتی:
-گرنگ ئەوەیە بێیت، میراش لە هەموو کەس زیاتر پێی خۆشە.
ئاوڕی لە میرا دایەوە و لێی پرسی:
- وانییە میرا؟
- بێ گومان.. بێ گومان، بەڵام بڕوا ناکەم بێت.. بەڵێن زۆر دەداو دوایش لەبیری دەچنەوە!
من میرا؟ بەڵێنی چیم داوە؟
رادمیلا وەڵامی دایەوە وەك بڵێیت قسەکانی میرا هانی دابیێ گوتی :
- کە لە شاخ بووین چەند جاریێ هانم دا بۆت بنووسیێ وا بزانم یەکجاریش نەینووسی.. نووسی؟
- بۆ نووسین بە ئومێدی نامەی زۆر نیم، دەمەویێ بەڵێنەکەی بپاریێزیێ و ئێمەی لەبیر بیێ بەسە ئەگەر مانگی یەك نامەشی نووسی!
- دڵنیاین دەنووسم.. تا ئەم رادەیە بە خراپی لێم تێمەگەن! شێوەی هێرش دیسانەوە دەستی پێکردەوە. برادەریێ گوتی:
-دەمانەویێ هەموو شتیێ بزانین پێش ئەوەی سەفەر بکەی.. میرا تووڕە نابیێ. ژنەکان، ژنەکانت بۆ کیێ بەجێهێشت؟
-میرا دەزانیێ من سوپاییێك لە ژنم نییە!
-من هیچ نازانم!
میرا وەڵامی دایەوە.

- کێ دەزانێ؟

برادەرێ پرسیاری کرد.

رادمیلا گوتی:

- مـن دەزانم... چـی دەزانم ! بەشـێك لـە پەیوەندییـەکانی دەزانم.. بـۆ هـەموو پەیوەندییەکانی ئەوا لە شەیتان زیاتر کەس نایزانێ!

هەموویان پێکەنین.. تەنانـەت مـیراش پێکـەنی یـان وای دەرخسـت کـە پێدەکـەنێ بـۆ ئـەوەی وەکـو ئـەوان بـێ.. ئایـا لیلیـان دەناسـن؟ ئایـا رادمـیلا دەچـێ بـۆلای لیلیـان؟ لەبیرمە جارێکیان باسی باوڵام بـۆ کـرد، بـەڵام ئـەو ئەوسـا هـیچ قسـەی نـەکرد! رادمـیلا دووبـارە دەسـتی پێکـردەوە، دەیویسـت تۆڵـە بـۆ شـەوەکەی شـاخ بکاتـەوە. بـەڵام ئـەو شەوە، بەتەنیا خـۆی منـی هەڵبـژارد، ئەگـەر ئیڤـان لـەوێ بوایـە دەیزانـی چـۆن رادمـیلام بریندار کرد... بەڵام کـەڵکی تۆڵەسـەندنەوە چییە؟ بـە خـەیاڵم دا نـەهات خراپـە دەرهـەق رادمیلا بکەم.. مرۆڤ بوو کاتێ منی جێهێشت بۆ لیلیان.

گوتم.. وام پیشان دا ئاگام لە هیچ نییە:

- رادمیلا... دەبێ هـەموو شـت بڵێیـت... ئەگـەر دەڵێیـت مـیرا وا دەزانـی شـت زۆر دەزانی.. وا حیساب دەکا کە من هەڵمدەخەڵەتاند.

- مـن و مـیرا دەزانـین چـۆن هەڵسـوکەوت بکـەین.. هـەموو شـتێکی پـێ دەڵـێم، تـۆش.. دەبـێ دان بـە هـەموو شـتێکدا بنێـی، پـێش ئـەوەی سـەفەربکەی!

-دەتەوێ چی بڵێم رادمیلا؟

- چیت کرد؟ ئەو ژنانەی دەیانناسن کوان؟ بۆچی دەرهەق بە میرا هەڵەت کرد؟

دەیویست بەردەوام بێ، بـەڵام لـەپڕ پێکـەنینێکی تونـد دەمـی پـڕ کـرد، تەنانـەت دوو فرمێسکیش لە چاوەکانییەوە سـەریان کـرد، لـە مـیرا نزیـك بـووەوە و باوەشـی پێـداکردو شتێکی پێی گوت، کە ئێمە گوێمان لێ نەبوو، بەڵام هەردووکیان پێکەنین!

کۆمەڵە بچووکەکە جـوولا... هەنـدێ لـە دۆسـتان وەسـتان بـە قسـەکردن کـرد و مـیرا و رادمیلا تۆزێ دوورکەوتنەوە.

دەبایـە شـتێ بکـات لـەو ماوەیـەی کـە بـە دەسـتییەوە مـاوە. ئەمـەم بـە دۆسـتێك گوت و بۆ هەزار جاریش سووربووم لەسەری:

- لەبیرت نەچێ. کتێبەکان باش ببەستی و زوو رەوانەیان بکەیت.

- برادەرێ لێم نزیك بووەوە. دەستی خستە سەر شانم و گوتی:
- دەزانــی... مــن ژنم نییــە، بــۆ یــەکێکم بــەخێری خــۆت نــادەیتێ پــێش ئــەوەی سەفەر بکەیت؟
- کاتێ خێرو سەدەقە تەواو... هەموویانم کرد بە خێر!
- دانەیەك و لای خوا خێرێکی گەورەت بۆ دەنوسرێ!
- پــێم گوتی:دابەشــکران،ئەوەندەت لەســەرە چــاوەڕێم بکــەی تــا هــاوینی دادێ دەگەڕێمەوە!
- یەك ساڵی تەواو چاوەڕێ بکەم؟
- ئەی چی بکەم هەر میرام بە دەستەوە ماوە.. دەتەوێ!
- میرا وەك خوشکمە.. هی ترم دەوێ!
- هاوین.. هاوینی داهاتوو.

دوو لە برادەران لە پشتمانەوە بــوون، گوێیــان لــە بەشــێ لــەو قســەیە بــوو زۆر پێکــەنین بــە دەنگــی بــەرزو هــەرا، بــە رادەیــەك ســەرنجی زۆر خــەڵکی راکێشــا، لەوانــەی بــە دەورمانەوە بوون.

یەکێکیان گوتی :

- ئەمە... ئەمە.

ئاماژەی بۆ کردو گوتی :

- ئەوەندە ژنی لەلایە کە لای هەمووان هەیە!

بە تووڕەیی وەڵامی دایەوە:

- چی زەرەر دەکا ئەگەر یەکێ یان دوانمان بداتێ.
- ئــەوە گــوێی لێتــە وا دەڵێــی، وا دەزانــێ هــەموو خــەڵك وەك خــۆت وان.. ئــەم پیاوە، ئاماژەی بۆ من کرد، پاشان بۆ میراو گوتی :
- لەم ژنە زیاتر کەس ناناسێ.

میرا ئاوڕی دایەوە.. پاشان هات بەرەو لامان.

برادەرێ پێی گوت:

- میرا.. وریابە پیلان دەگێڕن.
- سەبارەت بە چی؟

بەمیرام گوت و دەشمویست لە توندی شیمانەکان یان هەڵە کەمبکەمەوە.

- میرا... هەموویان دەیانەوێ من لای تۆ خراپ بکەن، دەڵێی چی؟

بێ ئەوەی وەڵام بداتەوە.. دەستی کردە ملم و ماچی کردم، ماچێکی فێنك و خەمگین بوو، رادمیلام بینی لەو ساتەدا پێدەکەنی و چاوم لێ دادەگرێ، وەك بڵێیت بیەوێ شتێکم وەبیر بهێنێتەوە!

***

پێم گوتن خەتا لە دڵی مرۆڤدا لە دایك نابێ، بەڵام لە دڵی رێکەوتی کوێردا، لە شوێنێکی تاریك کە نەرەنگی خۆر دەزانێ و نەتامی با. بەو شوێنە رەشە ناپاکەدا خەتا لە دایك دەبێ.

بڕوا دەکەن کە من سێ جار لەم دوو هەفتەیەدا هاتمە وێستگە؟ دەبێ بڕوا بکەن، چونکە من بۆ خۆم هاتم. دوو هاوڕێم بەرێ کرد و پێشوازیم لە سێیەمی کرد.

هەرسێ جارەکە وێستگەکە پڕبوو لە خەڵك، لە عەرەبانە، لە جانتاو چەپکە گوڵ، لەو وێستگەیەدا فرمێسکی خەماویم بینی، هەروەها فرمێسکی شادیش، خەڵکێك دەهاتن هی دیکە دەڕۆیشتن، من کە ئێستا سەفەردەکەم ئاڵا سپییەکانم بەرزکردەوە، چیتر خەونم بە هیچەوە نەدەدیت! رۆژانی شاخ کۆتاییان هات و چەند مانگی کە دوای ئەو هات بریتی بوون لە گەڕانی بێ ئەنجام و چاوەڕوانی. دووجار لیلیانم بینی، هەردوو جارەکە بێ تاقەت بوو و ئاواتەخوازبووم نەمبینیبایە.

ئێستا... خۆر دووکەڵی شەمەندەفەرەکان بڵاوە پێ دەکا، چەپکە گوڵە هەڵگیراوەکان، جانتای ئەوانەی سەفەردەکەن، کە پڕن لە شتی بێ کەڵك، لە کۆتاییدا کۆمەڵێ خەڵك کە هاتوونە دوا وشەی خۆیانم پێ بڵێین، پێش رۆیشتن!

چیتر جوێن بە کەس نادەم.. پیاوەکانی کەنیسە لە گوناهەکانم خۆش دەبن. تەنانەت ئەو گوناهەش کە جوێنم بە کەنیسەداو بڵاوم کردەوە، کە بیرو بۆچوونی زۆرم لا سووك و بێ نرخە.. هەروەها "اليسوع الناصری" وەك پێویست رێزم لێ نەگرت، لەگەڵ ئەمەشدا دەمەوێ لەیەك شت بگەم پێش ئەوەی بمرم:

ئەوەی دەمەوێ لێی تێ بگەم ئاسانە بۆ هەموو یەکێك لە ئێوە، لەوانەیە پێویستیش نەکا پرسیار بکەم.. ئێوە... بەڵێ ئێوە.. وەڵام دەدەنەوە.. بەڵام راوەستن.

خۆم لە میرا نەدەکێشایەوە نابینیم.

گاڵتە ناکەم، نەخەوتبووم و نەهەڵەبووم.. بەم دوو چاوەم بینیم.

پەلەی بوو، تابلۆکەی خوێندەوە تاکو بزانێ شەمەندەفەرەکەی لە کوێ دەوەستێ، هەرکە چاوی لە تابلۆکە لادا من بینیم!

لیلیان چاوەکان، دەم و چاو، خوێن، پەرۆشی، خەمی بەرچاو، جانتایەکی مام ناوەندیی بەدەستی راستی هەڵگرتبوو و دەستەکەی تریشی بە دەستی کوڕە بچووکەکەیەوە بوو.

خەڵکینە لیلیان بوو.

کە من بینیم لەرزیم. هێزم لەبەر بڕا، (هەندێ جار خۆم زۆر بە ئازا دەزانم) ئەو زەردەخەنە بچووکەی لەسەر لێوم نەخشاندم کە گەیشتمە وێستگەکە، کەوتە نێوان هەردوو قاچە لەرزیوەکەمەوە!

لیلیان منی بینی، ئەو رەنگە زەردەمی دیت کە لە دواییدا لەدەم و چاوی ئەودا رەنگی دایەوە، لەو پێکەنینە خەماوییەی کە لە پڕ لە چاوەکانیدا تەقییەوە.. لیلیانم بینی.. لیلیانیش منی بینی ئەمجارە، وەك جاری پێشوو نەبوو کە خەریك ترومبێلێك بمکا بە ژێرەوە، کە بینیم ترامەکەی دەڕوا!

بەخۆبە دەستەوە دانێکی بێ مانا جەنتاکەی لە دەس بەربووەوە.. کەوت یان خۆی بەری دایەوە، لە من مەپرسن، سەرسوڕماو وەستا... ئایا دێتە پێشەوە؟ ئایا رووی بە تووڕەییەوە وەردەچەرخێنی و دەڕوا؟ ئەی من.. من دەتوانم چی بکەم؟

چۆن دیمەنکە دەستی پێکرد؟ چۆن کۆتایی هات؟ بڕوا بکەن نازانم، ئەگەر بەیەکی لە باوکە پیرۆزەکان — الاباء المقدسون — کە نازانم چاوی تێدەبڕیم تا رادەی چوونە ناو خوێنمەوە، هەروەها بە دزیشەوە جنێوی پێ دەدام و دەیگوت خەتای نەفرەتلێکراو لە خوێنمدا دەخەوێ و قەتیش لێی رزگارنابم.

بەرەو روی یەکتر رامان کرد، منداڵەکە بەسەر سوڕماوی لای جانتاکە وەستابوو، لە کوێ بەیەك گەیشتین؟ لە نیوەی رێگا ؟ من خێراتر رام کرد؟ ئایا ئەو بەرەو لای من رایکرد؟ هیچ کەسێ وەڵامی ئەم پرسیارانە نازانێ، هەردوو دەستی بۆ درێژکردم، دوو دەستی پڕ لە مل کەچی و پاڕانەوە بوون. منیش دوای ئەوەی هەردوو شانیم گرت، نازانم چۆن دەستم گەیشتە هەردوو قۆڵی، هەر دوو قۆڵیم گرت و تەماشای دەم

و چـاویم کـرد و خـەریك بـوو دەسـت بـە گریـان بکـەم، ئایـا هیچـم پێـی گـوت لـەو سـاتانەدا؟ ئایـا ئـەو هیچـی وت؟ ئـەی باوکـە پیرۆزەکـان بـڕوام پـێ بکـەن کـە هیچـم لەبیرنییە.

لەپڕ چاوی کز بـوو، روونـاکی سـنگم لـەپڕ کوژایـەوە، دنیـا تاریـك بـوو. لـەو سـاتەدا قـــۆڵیم گوشـــیی دەمـــەوێ دووبـــارە چـــاوەکانی دەس بکەنـــەوە بەقســـەکردن و رۆحـــم رزگاربکەن لەو گێژییەی تووشی بوو، شتێ زیاتر لە ئازار.بەنائومێدی هاوارم کرد:

- لیلیان.. تۆ لە کوێیت لیلیان؟

تەماشـای کـردم و وەڵامـی نەدامـەوە. تەماشـاکردنەکەی کانیـاوێکی ئـێش و ئـازار بـوو، تەماشـاکردنەکەی پاڕانەوەیـەکی لاڵ بـوو بـۆ ئـەوەی ڕابکـەم، نـەمێنم، هـاوارێکی گەرم بوو بۆ ئەوەی لەو شـوێنەدا وەك دوو بـاز کـە شـەڕیان کـردو و پاشـان خۆیـان کوشـت بمێنین، لە شوێنی خۆیان وەستان هیچیان نەویست.

شتێ بڵێ.. هەرچییەك بێ لیلیان..

بۆ یەکـەمجار گـوێم لـە دەنگـی بـوو. لـە خۆشـی ئـازار گڕبـوو، چـەند وشـەیەکی وت کەس گوێی لێ نەبوو..

- دەتەوێ چی بڵێم؟
- بەدرێژایی ئەمساڵ لە کوێ بوو؟ بڵێ لە راهی خوا!
- من؟...من؟ دەبێ لە کوێ بم؟
- لیلیان... بریا دەرنەدەکەوتی!
- بەڵام من نازانم کە تۆ لێرەی.
- ئەگەر بتزانیبا هیچت دەکرد؟
- نازانم!

شـانی هەڵتەکانـد، چـاوەکانی لیلیـان تیشـکیان لێ دەبـاری، ئـەو شـتانەی لەبـەر دەچوو کە وشـە نایـانزانێ و عـەقڵیش نایانگرێتـە خـۆ. چـاوەکانی لیلیـان.. چـاوەکانی... چەند سووتاو و زیـرەکن.. چـەند جوانییـان تێدایـە.. خەڵکینـە.. بـڕوا بکـەن مـن خـەریك بوو بمرم کە تەماشای چاوەکانی لیلیانم کرد!

بەسەرسـوڕمانێکەوە ئـاوڕم دایـەوە، مندالەکـە هـەر لـە جێـی خـۆی بـوو بەتەنیشـت جانتاکـەوە، و دەسـتی بـە گریـان کـرد. تەماشـای کـردم و نـاو لـەپی دەسـتی چەپیشـمی

گرتبوو، نەیدەویست بەری بدا و نەشیدەزانی چۆن بەرەو لای منداڵەکە بڕوا؟ بانگی کا؟ رابکا؟ لە کات و شوێنی وادا دەبێ چ جۆرە بیروبۆچوونێك بۆ مرۆڤ بێت؟ من هەموو ئیشێکم دەدیت لە ژێر قژی لیلیان و لە سنگیدا شەپۆل لێ دەدا. لەگەڵ ئەو بیرم دەکردەوە. بیرمان نەدەکردەوە، ئێمە بەیەکەوە لە هەموو سانییەیەکدا بەرەو لای مەرگ هەنگاومان هەڵدەهێنایەوە، پێ بە هەزاران خەوندا دەنێین، دەگرین و دڵخۆش دەبین.. دەخنکێین و دەمرین. منداڵەکە بەتەنیا خۆی هات و جانتاکەی بەجێهێشت. رامکرد. جانتاکەم هێناو گەڕامەوە لای. کە گەڕامەوە ئەو خەڵکە کەمەم بینی، کە پێش دەقیقەیەك لەگەڵیان بووم دەجووڵان و ریز بووبوون و تەماشای منیان دەکرد، چاوەکانیان وەکو شیشی سوورەوە کراو بوو، پڕ لە پرسیار، گلەیی، سەرسوڕمان، رادمیلاش لە دوورەوە خەمبار دیاربوو.

ئێستا چی بکەم؟ لیلیان بۆ هات؟

بێ هۆش پرسیارم لێکرد:

- لیلیان لێرە چی دەکەیت؟
- سەفەردەکەم.
- بۆ کوێ؟

سەری بە خەمێکی پڕ لە ئازار راوەشاند و گوتی:

- بۆ ئیتالیا.. ئەی تۆ؟
- من؟ نازانم لیلیان... لەوانەیە بگەڕێمەوە نیشتمان!
- گوێم لە فیکەیەك بوو، فیکەی یەکێ لە برادەرەکان، پاشان بانگی کردم.

لەو ساتەدا دەبایە شتێ بکەم.

- بە لیلیانم گوت وەك تکایەك.
- برادەران..

ئاماژەشم بۆیان کرد.

دوودڵبووم.. چی دەتوانێ بۆنی بکا؟ لەو هەڵوێستە نەگبەتیە یا چیی لە برادەرکانم داوە.

تەماشای کـردم بـە ترسـەوە.. بـە چـاوەکانی تەماشـای کـردم.. چـاوەکانی مەشـخەڵی پـیرۆزن، جـوانی بەرەبـەیانێکی بـەهاری ..یەکـەم گاسـن زگـی زەوی و ڕێ.. گوتی،ئـەو گوتی.

- بەدرێژایی ئەم چەند مانگەی رابوردوو لە کوێ بوویت؟
- لەم شارە نەفرەتلێکراوەدا بووم لیلیان!
- ئەی بۆ نەتمبینی؟
- ئەی من... من بـۆ تـۆم نـەدی، هـەموو شـوێنێك گـەڕام. زەویـم هەڵکەنـد، لـە ژێـر پەنجەرەکانـدا بەشـەو دەگـەڕام، لـە چـایخانەکان کـەوتم، تەماشـای هـەموو دەم و چاوەکانم کرد لە دووجار زیاتر تۆم نەدی!
- یەك جار تـۆم دی، زۆر خەفـەتم خـوارد، کـە لـە وێـستگەی دوای ئـەو دانەبـەزیم نەمزانی دوای ئەوە چۆنت ببینم!

یەکێ لە برادەران کێشـای بەسـەر شـانما، خـەریك بـوو بمـرم کـە بـیرم دەکـردەوە لیلیـان دەڕوا، ئـاوڕی لێ دایـەوە. جـارێکی دیکـە تەماشـای دەم و چـاو و چـاوەکانیم کـرد، سەری چەند جارێ لەقاند، پێکەنینێك، کـە لـە مـن زیـاتر کـەس نەیـدەدیت. کەوتـە سـەر لێوەکانی، وەك بیر بکاتەوە بڕیاری دا لەگەڵم بکەوێتەڕێ.

پێش من بەنیو هەنگاو کەوتبوو.. ئاوڕی لێ دامەوە و لێی پرسیم:

- کەی شەمەندەفەرەکەت دەڕوا ؟
- لە دەونیو... ئەی تۆ؟
- لەدەو چل دەقیقە.. چارەکە سەعاتێ لە کاتی خۆی دواکەوتووە!

چـاوەکان وەك قورقـوشمی تـواوە دەڕژان بەسـەرمانا لـە دەم و چـاومان دەکۆڵنـەوە، کراسـەکەی لیلیـان، مندالەکـەی، جموجۆلـەکانی، بێـدەنگی لـەو نـاوەدا قـورس و کـەڤنار و پڕمەترسی بوو.. چیتر کەس گـوێ لـە گـڕەی شـەمەندەفەر یـان هـاواری شـت فرۆشـەکان نـەبوو.. منـیش.. دەلـەرزیم و تووشـی کێشـەیەك ببـووم نەمـدەزانی چـۆن ڕووبـەڕووی ببمەوە یان چۆن لەگەڵی ڕابێم!

تـەنها نـاوی ئـەوم پـێ وتـن، گـوتم لیلیـان. لێگـەڕام بـۆ ئـەوەی هەریەکـەیان خـۆی بناسـێ، نـاوی خـۆی بڵـێ، نەمویسـت یـان نـەمتوانی هـەموو ناوەکـان بڵـێم، ئەگـەر بمگوتبایە لە ماندووبوون و

ترسا دەكەوتم ليليان زەردەخەنە سەركەوتووەكەی بەسەر لێویەوە بوو، كە دەستی درێژكردبۆ هەریەكێ. شەرمن بوو، تەماشای كردنەكانی بۆ هەردەم و چاوێ لە چركەیەك تێنەدەپەڕی وەك بڵێیت بڕیاری دابوو هیچ دەم و چاوێ لەبەرنەكا یان نایەوێ دوای ئەوە ئەو دەم و چاوانە ببینێ.

دوای ئەوەی دیسانەوە بێدەنگی باڵی كێشا بەسەر دانیشتنەكەدا، رووی دەمم كردە رادمیلا و گوتم:

-رادمیلا.. ليليان دەناسی.. ساڵی پار لەگەڵمان بوو لە شاخ.

بەزەحمەت هەناسەم بۆ درا.. پاشان گوتم:

- لەبیرتە؟

تەماشای دەم و چاوی یەكترمان كرد، تەماشاكردنەكەی ليليان وەك داواكردنی لێبوردن وابوو، وەك هیچی لەبیرنەمابێ، رادمیلاش لچی هەڵقورتاند و شانی داتەكاند، وەك نەیەوێ شتی بیربێتەوە.

دووبارە بێدەنگی.

ئەی خوای دڵڕەق، ئەی رێكەوتی كوێر، بۆ هەموو شتێ بەمجۆرە روودەدا؟ ئەگەر ليليانم لە شوێنێكی دیكەو لە كاتێكی دیكە بدیبایە، لە ژیانمدا گەورەترین سروود كە مرۆڤ بتوانێ هەڵی بگرێ روویدەدا. بەڵام لێرە پەلە هەورێكی ئەفسانەیی لەسەر سفگە دەمكا بە خاڵێكی رەش لەنێو ئەم هەموو خۆشییەدا ،برادەرێ ویستی بێدەنگی و نائومێدیدەكە بشكێنێ و گوتی:

نەماندەزانی برادەرێكی وا جوانت هەیە!

دەم و چاوی ليليان سوور هەڵگەڕا. گۆناكانیم بینی سووربوون بەقەد ئەو زەردهەڵگەڕانەی دەموچاوی میرا. گوتم و هەوڵم دەدا وشەكان بە قایم بڵێم بۆ ئەوەی لە دەستم رانەكەن:

-هاوینی رابردوو یەكترمان بینی، رادمیلا لەوێ بوو.. دوای ئەوە یەكترمان نەدیت.

دەمویست رادمیلا یارمەتیم بدا، دەمویست شتێ روبدا نەمزانی كام لە برادەرەكان گوتی

- كاتی خوا حافیزی هاتووە!

-  ئایا کامیان مانای کات دەزانیّ؟ کاتی قورس و مەلەوانکەر لە بۆشایی ئاسماندا هەیەو نامێنیّ؟ بلیمەت و گەمژە؟

کاتێکی تیژبوو وەك کەوتنی بەردی (نەیزەك). کات رۆیشت بێ ئەوەی هەستی پیّ بکەم، زۆر قورس هەر لە دەستی دوژمنی دەکرد، کە لە قورگگیردەبیّ. گەش و تووڕە بوو. ئەم کاتە، ئەم زەمانە خۆی کە لە میلی سەعاتەکاندا چاودێریان دەکەین. دەبیّ بە چەقۆ و لە دڵ دەچەقیّ، دەبیّ بەقەترەیەك لە دەریایەکی بیّ سنووردا هەمان میلی سەعات کە قەت ڕێی خۆی ناگۆڕی و بەهەمان نەرمی و هێز دەڕوا، لەو بەشەی سنگدا نەفرەتێك — لعنە- بەجیّ دێڵیّ، کە رۆژگار ناتوانیّ بیسڕێتەوە!

لیلیان ئەو مرۆڤەی ئێستا لەبەردەممدا دەیبینم بە بوونی زیندوو و گەشەکردو بەسەربەرزی هەمیشەیی، کە میلەکانی سەعات و زەمەن ناتوانیّ بیگۆڕیّ، بە گەورەیی پڕ هێزییەوە یان بیّ دەسەڵاتی تەواوەوە ئایا دەکریّ بۆ یەك جار لە دەستم بچیّ و تا هەتا هەتایە ونی بکەم؟

ئەی شەمەندەفەرەکان بڕۆن. بە هەموو لایەکدا بڕۆن خەڵك هەڵگرن، خەمەکان و خۆشیەکانییان هەموو شتیّ هەڵگرن، بەڵام لیلیان قەت ناتوانیّ شوێنی ئەو لە یادەوەریی مندا بگۆڕیّ. لە شاخ.. کە ڕاکشابوو لەسەر لمی دەریاچەکە، کە قاچی بەرزکردەوە بیخاتە سەر لێواری باڵکۆنەکە، کە ئێمە بەیەکەوە سەمامان دەکرد، ئێستا... لێرە.. لە وێستگەی شەمەندەفەر.. لە دوا چرکەکاندا

برواتان بێت هەمووم ماچ کردن لیلیان نەبیّ، هەموو ئەوانەی لە دەورم بوون، ژن و پیاو، خەریك بوو هەڵەبکەم، پیاویّ ماچ بکەم کە لە نزیکمانەوە وەستابوو، بەڵام لیلیان.. نەمتوانی بیر لە ماچ کردنی بکەمەوە.. دەستی کە دەستمی دەگوشی بڕوای پێغەمبەران و ئازایەتیانی هەڵگرتبوو، کە لە پەنجەرەی شەمەندەفەرەکە وەستا، ملم بردە پێشەوە، بەرادەیەك خەریك بوو بەر سەری لیلیان بکەویّ.. بە سۆزێکی زۆرەوە پێم گوت:

-  ناونیشانەکەتم دەویّ لیلیان، بۆ ئەوەی بۆت بنووسم، لەوانەشە بێمەوە. بیّ ئەوەی قسە بکا سەری لەقاند و داوای لێبووردنی کرد تەنها وشەیەك، کە لە زاری هاتەدەر.

-  کەڵکی نییە!

پـێش ئـەوەی شـەمەندەفەکە بـە دەقیقەیـەك یـا دوان بـڕوا. لیلیـان تەماشـای کاتـژمێری وێسـتگە کـرد و داچـڵەکی دەسـتی درێـژکرد بـۆ دواجـار کـە دەسـتم دەسـتی ئـەوی گـرت هەسـتم کـرد دنیـا تاریـك دەبـێ، کۆتـایی دێ. خـەریك بـوو بگـریم، هـاوار بکەم، دەمویست راوەسـتێ هەرچـی دەکـا بـا بیکـا بـەلام نـەڕوا.. بـەلام لیلیـان پـڕ بـڕوا بـوو دابـوو، دەسـتی تونـد گوشـیم ئـەمجارەیان بـەلام زووش کێشـایەوەو.. رایکـرد، نەیویست زیاتر راوەستێ دەستی بەرزکردەوەو خوا حافیزی لێ کردم و دوورکەوتەوە.

مـیرا خـوێن گـەڕاوە دەموچـاوی. بینـیم پێدەکـەنی، بـەلام رادمـیلا.. پێکەنینەکـەی نـەما، چـونکە هـەوڵی دەدا بـیر بکاتـەوە.. شـتی بێتـەوە بـیر، برادەرەکـان بازیـان دەدا، باوەشـیان بـە دۆسـتەکانیاندا دەکـرد، چـاوبڕکێیان لەگـەڵ کچـانی شـەمەندەفەرەکەدا دەکـرد. بـە دەنگـی بـەرز پێدەکـەنین، بـەیناو بـەنیش یـەکێکیان بەشـتێکی دەکـرد بـۆ ئەوەی ئەوانی دی بهێنیتە پێکەنین!

دەمویسـت لەسـەر کورسـییەکەم دابنیشـم و دەس بـە گریـان بکـەم، دەمویسـت لـە شـەمەندەفەرەکە بازبـدەم و کۆتـاییم بـێ، دەمویسـت دوای لیلیـان بکـەوم، بـەلام هـەموو شتێ تازە بوو بە "مستحیل"!

هـەر کـە دەسـتم بۆیـان بـەرزکردەوە لـە پەنجـەرەی شـەمەندەفەرەکەوە یەکسـەر وەك گیانەوەرێکی هار چوومە بەری دووەم..

لیلیانم بینی لـە شۆسـتەی بەرامبـەر بـوو، تـەنها چـەند مـەترێکمان لـە نێوانـدا بـوو، لـە چـاوەکانی زیـاد لـە فرمێسـکێکم بینـی. لـە چـاوەکانیدا کۆتـایی هـەموو شـتێکم بینـی.. لەگـەڵ ئەوەشـدا دەسـتی بـەرزدەکردەوە و خواحـافیزیی دەکـرد. کـە شـەمەندەفەکە دوورکەوتـەوە وەك کـۆترێکی بچـکۆلەی بـۆر هاتەبەرچـاوم، کـۆترێکی راستەقینە، کە دەدا لە شەققەی باڵ.. بەلام بە خەمبارییەوە.

## خەونەکانی خۆرو باران:

سـالان هـاتن و چـوون. زەوی چـەندین جـار سوڕایەوە،بچـکۆلەکان گـەورەبوون، هەنـدێ لـە گـەورەکان مـردن، بـەلام لیلیـان لـە یـادەوەریی منـدا وەك تۆفـان هەرایـەتی، نەرادەوەسـتێ و نـەهێمن دەبێتـەوە. ئەگـەر خۆرهـەلات و تـەمی بـەیانیانی رەوانـدەوە..

ئەگەر باران هات.. ئەگەر ئاسمـان بـە مـژدەی بـاران خـەونی بینـی، رادەوەسـتم بـۆ ئـەوەی شتێ لە رابردوو بەرم، دەستم بکەوێتەوە.. بەڵام کام رابردوو؟ لیلیان و هەر لیلیان!

مـرۆ ون دەبـێ، بچـووك دەبـێ، پاشـان دەبـێ بـە کـۆترێکی بـۆرو لـە یادەوەیمـدا لـە شـەقەی بـاڵ دەدا ئـەو یادوەرییـەی خەریکـە پـیر دەبـێ و شـتی لـە بیردەچـێتەوە. داچڵەکانی تـرس، سەرسـوڕمان، سـۆز، دەسـت گوشـین... هـەموو ئەمانـەم دێتـەوە یـاد و حەز بە گریان و تێکشکان دەبێ!

ئـەو وشـانەی ئێسـتا لـە مێشـکی ئێـوەدا دەخولێتـەوە دەزانم: خـەون دەبینـی، هەرزەکارە،بێ بەشـە، رۆمانسـییە، هـی دیکـەش؟ مـن ئـەم وشـانە دەزانم و هـی دیکـەش کـە زۆر لەمانـە پیسـترن، تونـدترین ،جنێـویش دەزانم. بـەڵام کـە هێشـتا نـەبووین بـە دوژمن بۆ شـەڕ بکـەین، بـەدەس یـا بـەدەم. چـی دەڵـێن بیڵـێن.. گـوێ نـاگرم... ئێـوەش دەتـوانن واز لـە خوێندنـەوە بێـنن، بـەڵام بـێ جوێنـدان و پاشـان هەریەکـەمان لـە رێگەیەکەوە دەڕوا. لەوانەشـە بـبین بـە دۆسـتی یـەکتر (دڵـی مـرۆڤ زۆر جـوان و توندیشـە) وەك من و میرا و من وپاولا کردمان. بەڵام لەم ساڵانە چی روویدا.

گەڕامەوە نیشتمان، لـە فەرمانێکـدا دامـەزرام، هـەموو رۆژێکـی ئـەو رۆژانـەی پێـنج سـاڵەکەم دەهێنایـەوە یـادەوەریی خـۆم، بـەڵام سـەرقاڵی ژیـان و خەمـەکانی رایکـرد وردە وردە یادەوەریەکان لـە دڵمـدا کـز بـین دووربکەونـەوە، جگـە لـەو مەخلووقـەی ڕووبـەڕووی لەبیرچونەوە و نەمانە.

لەم چـەند سـاڵەدا زۆر شـت گـۆڕان، مـیرا زۆری بـۆ نووسـیم سـەرەتا.. یەکـەم نامـەی بـۆ نـاردم کـە لـەو کاتـەی لـە وێسـتگە گـەڕابووەوە نووسـیبووی، نامەکـە تونـدبوو، زۆر لای لیلیانەوە وەستابوو، گـوتی :" بـە کـورتی دەمـەوێ بـزانم ئـەم ژنـە کێیـە؟ " و گـوتی :" لێـت خـۆش نـابم و تاحەسـێمەوە تـا دەیناسـم." ئـەوەی منـیش بـۆم نوسـیبوو زیـاتر تووڕەی کرد. گـوتی:" نامـەوی بڵـێم درۆت لەگـەڵ کـردم. بـەڵام لێـرەدا شـتێ هەیـە لێـی تێناگـەم." بـەڵام رۆژگـار تێپـەڕین و مـیراش نەگەڕایـەوە سـەر ئـەو چـیرۆکە مەگـەر بـە راگوزاری، دوای ئەوە نامـەکانی مـاوەی زۆرتـری پـێ دەچـوو، پاشـان ماوەیـەك بـڕا.. کـە هاتەوە نوسیبووی: " شووم کرد.. بەڵێ شووم کرد.. وەك تۆ لێت داوا کردم."

لـــه نامـــەکانی دوای شـــووکردن، زۆر باســـی یادەوەرییـــەکانی پەیوەندییەکـــەمانی دەکرد، پـاش ماوەیـەك بـۆم دەرکـەوت لـە شـووکردن بێـزارە.. ڕۆژێکیـان پـیّ ی گـوتم :(( پەشیمانم زۆر پەشیمانم لەم پەیوەندییە سەخیفەی لێی تێناگەم))

کە چووم بۆ ئەویّ هـاوینی سـێیەم بـوو، بینـیم منـداڵێکی هەیـە، دوای پێـنج مـانگی دیکـە منـداڵێکی دیکـەی بـوو. زۆر جـار ئـەوەی مـرۆڤ لـە نامەکانیـدا دەینوسـیّ زۆری مەبەسـت نییـە، بـە تێپـەڕبوونی ڕۆژگـار مـیرا بـوو بـە ئـافرەتێکی سـەقامگیر، یـان(( بەرەو سـەقامگیری دەڕۆیشـت" هـەموو شـتێکی لەبیرچـووبووەوە جگـە لـە منـداڵ و مـاڵ و ئیش و لە دواییشدا مێـرد. شـیعر چـیتر مەسـەلەیێکی گـرنگ نـەبوو، لـە ژیـانی ئـەودا راستە هێشتا شیعر دەخوێنێتەوە بەڵام " خوێندنەوەیەکی عەجول و خەمۆکی".

بـاولا.. کـەس لـە بـرادەران نەیـدیبوو، زۆرم لیّ پرسـی.. کـە سەفەریشـم کـرد هـەر هـەواڵم پرسـی، بـەڵام کـەس هیچـی لەبارەیـەوە نـەدەزانی.. نـە سـەبارەت بـە خـۆی نـە هەواڵی.

رادمـیلا و ئیڤـان بـوون بـە هاوسـەری یـەکتر، ئێسـتا منـداڵێکیان هەیـە، تەمـەنی حـەوت سـاڵانە و کچـێکیش سـیّ سـاڵان. سـەرەتا زۆریـان بـۆ نووسـیم و گوتیـان پـرۆژەی گەشـتێکیان بـە دەسـتەوەیە رەنگـە بێنـە سـەردانم، بـەڵام کـە سـەرم لێـدان پـێش سـاڵیّ گوتیان چـوون بـۆ سـوید و ئیسـپانیاو بـەهۆی منـداڵ و قسـتی ئـەو خـانووەی کڕیوومانـە ئەم چەند ساڵەی دوایی نەمانتوانیوە سەفەربکەین.

رادمـیلا کـاتیّ شـەرابمان دەخـواردەوە لـەو یانەیـەی دەڕوانێتـە سـەر رووبارەکـە لێـی پرسیم:

- ئێســـتا کـــە هـــەموو شـــتیّ کۆتـــایی هـــات و دەم و چـــاو و یادەوەرییـــەکان دوورکەوتنەوە دەمەویّ چیرۆکی ئەو ژنەکە هاتە وێستگە لە زاری تۆوە بزانم!

هەرچەندە من چـاوەڕێی ئـەو پرسـیارە بـووم لـە رادمـیلا، کەچـی شـڵەژام کـە ویسـتم وێنـەی بهێنمـەوە بەرچـاوی خـۆم.. پاشـان کـە هەنـدیّ وشـەی نـەزانراوم گـوت، رادمـیلا بەوەندەی گوتم رازی بـوو، بـەڵام بڕواشـی پـیّ نـەکردم، مـن لـە زەردەخەنەکەیـەوە هەسـتم بەوەکرد پاشان کە پەرداخەکەی بەرزکردەوەگوتی :

- لە پێناو ئازیزترین یادەوەری.. و لە هەمووشیان نهێنیتر.

هاتینەوە سەرباسی منـداڵ و کـەش و هـەواو فوتبـۆڵێن، پاشـان ژنـان، بـەڵام سـەبارەت بە ژنان نەمانتوانی ئـەو وشـانەی لـە سـنگماندا وەك بـای شـێت دێـت و دەڕوا بڵـێین. چـی مایەوە بۆ من ؟

دایك .. دایکی میرا پێش مانگێ لە دوا سەردانی من مردبوو. میرا گوتی:

زۆر باسی دەکردی و داوای کرد سەردانی گۆڕەکەی بکەی.

منیش وام کرد، بـەڵام لـە دوو جـاری پێشـتوودا دایکەکـە ئەوەنـدەی پـێ خـۆش بـوو، کە مـن خـۆم سەرسـام بـووم ، وەك منـداڵ سـەری خسـتە سـەر سـنگم و گریـا و داوای لێ کـردم کـە شـتەکانم لـەو ئوتێلـە پیسـە بگوازمـەوە ( چـونکە ئۆتیـل جـێ لەشفروشـان و دزەکانـە.. جگـە لـەوەی خزمـەت هـەموو شـتێ نییـە کـە گەشـتیار داوای بکـا.. باسـی خـواردن مەکـە.. لـە خـواردنی ئۆتێلەکانـدا مێشـولەو مێـروی ژەهـراوی هەیـە.. هـەموو شتێکیش فێڵی تێدا کراوە.))

چـەپکە گـولێکم هـەڵگرت و بـێ دەنـگ رۆیشـتین.. مـیرا لـە پێشـەوە و مـن و کچەکەشی لە دواوەوەی بـووین، کـە لـە گۆڕەکـە نزیـك بـووەوە بەسـەر ئامـاژەی بـۆ کـرد بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە، چـەپکە گوڵەکـەی دانـا بـێ ئـەوەی هـیچ بڵـێ.. راوەسـتام.. بـیرم کـردەوە.. هـەموو شـتێکم هاتـەوە بـیر، مـرۆڤ چـەند نەگبەتـە کـە دەبـێ بـە کۆمـەڵێ ئێسقانی رزیو.. من نەمتوانی بڕوا بکەم کە دایکەکە کۆتایی هات و بوو بە ئێسقان!

لیلیان مایەوە.

لەنامـەی سـێیەم کـە بـۆ بـرادەرێکم نـارد، لەگەڵمانـدا بـوو لـە وێسـتگەکە پرسـیارم لێکـرد، سـەرەتا وەڵامـی نەدامـەوە، بـەڵام دوای ئـەوەی بـۆ جـاری دووەم و سـێیەم پرسـیارم کـرد، سـەرنجێکی بچـووکی نووسـی: " لـە مـن مەپرسـە، نـەمبینیوە، ئەگـەر بشـیبینم لەوانەیـە نەیناسمـەوە، ئـەم لیلیانـەی تـۆ هـەواڵی دەپرسـی لەوانەیـە ببێتـە کێشـەیەك لـە نێوانمانـدا.. حیسـابێکی قـورس، چـونکە مـن تـەنیا کەسـێ بـووم هەسـتم بەوە کرد کە هەڵخەڵەتام.. بـۆ بـۆ مـن باسـی دەکـەی؟ بـۆ نـاوی دێنـی؟ لیلیـان مایـەوە ئێستا.. دەتەوێ چی بکەم."

لـە هەرسـێ گەشـتەکە ویسـتم خـۆم لـە بـرادەران بدزمـەوە و کـاتێ لـە وێسـتگە بەسـەربەرم، بەشـکو بیبیـنم.. رەنگـە سـەفەربکا.. سـەرەڕای چـاوەڕوانی دووردرێـژ نەهات!

لـە هەرسـێ گەشـتەکەدا تەماشـای عـەرەبانـەکانی تـرامم دەکـرد بەشـکو لـەوێ بـێ، بـەڵام لـەوێ نـەبوو، لـە چـایخانە و بـاخ و پەیکـەر، لـە هـەموو شـوێنێ گـەڕام، بـەڵام نەمدۆزیەوە!

ساڵان بەدواییەکـدا هـاتن، سـاڵ لـە دوای سـاڵ هـەموو شـتێ دەگـۆڕێ.. شـوێنەکان و مرۆکـان و دارەکـان.. تەنانـەت وێسـتگەی شـەمەندەفەرەکانیش.. تـەنها شـتێ کـە گەورەیە و کەس بەسەریدا زاڵ نابێ و ناگۆڕێ لیلیانە.

چـاوەکانی لیلیـان، چـاوە گەشـە خـەمبارەکانی.. چـاوەکانی سـەرەتای جیهـان و کۆتاییەکەیەتی بـە گـوێرەی مـن.. سـۆز، رۆژانـە، چـاوەڕوانییە، ئایـا مـن ئـەو چـاوەم ون کرد؟ ئایا تا هەتایە لێم ون بـوون؟ کـەس نـاتوانێ قەناعـەتم پـێ بێنـێ کـە کۆتاییـان هات.. یان کۆتاییـان دێ.. لەوانەیـە سـاڵێ تێپـەڕێ، دە سـاڵ، بـەڵام ئـەو دوو چـاوە هـەر دەدۆزمەوە، نەیاندوزمەوە.. بۆ جارێك تا هەتا هەیایە تیایاندا نوقم دەبم!

ئێسـتا.. کـە هەسـت دەکـەم وشـەو تیپـەکان زۆر بـێ بایـەخن بـەرادەییك بڕواناکـەم لیلیـان لـەو جـۆرە وشـانەدا هـەبێت. لیلیـان زۆر لـەوە نـەرمترە. زۆر دڵخۆشـتر و خەمبارترە. لە هەموو ئەمەی بۆم باسـکردن.. بـەڵام بڵـێم چـی سـەبارەت بـەم زەمانـە بـێ نرخە زەلیلە؟

هیچـم نییـە.. لیلیـان هێشـتا هـەر بـەرزە، لـە یادەوەریمـدا رادەکـات. بـە خوێنمـدا سەردەکەوێ، هـەموو سـاتێ دەمهێنێتـە گریـان، دڵـم خـۆش دەکـا.. نـا.. خەڵکینـە ئـەو چـاوەڕێم دەکـا.. لـە وێسـتگەی داهـاتوو چـاوەڕێم دەکـا.. بـەڵێ وێسـتگەی داهـاتوو نـازانم.. وێسـتگەی ترامـە.. هـی پاسـە، بـەڵام چـاوەڕێ دەکـا.. لـە شـوێنێك چـاوەڕێ دەکا.. دەیبینم.. گاڵتەم پێ مەکەن.. دڵنیابە هەر دەیگەمێ!